بنکەی توێژینەوە (7)

# مێژووی فەندەمێنتالیزمی ئیسلامیی سوننە لە ئێران

م. عەلی سینا

ناوی کتێب: مێژووی فەندەمێنتالیزمی ئیسلامیی سوننە لە ئێران

- نووسینی: م. عەلی سینا
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- بەرگ: ڕێبین
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: (٨٦٨)
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب (٩)



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
www.mukiryani.com
asokareem@ maktoob.com
Tel: 2260311

## پێڕست

## پێشەکی

بیری سەلەفیگەری و فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و درووستبوون و پەیدا بوونی ئەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدساڵ لەوەوپێش، بیر و بۆچوونی کەسانی وەك «ابن تیمیه ٦٦١١-٧٢٦ هـ.ق»» «ابن قیم الجوزیه٦٩١-٧٥١ هـ.ق» و .... بوو بە سەرەتای هەوڵدانێکی چەندین ساڵە و درێژخایەن بۆ گەڕانەوە بۆ لای ئیسلامی ڕاستەقینە و بوو بە دەسپێکی تێکەڵبوونی جۆرێك لە دەمارگرژی و توندڕەوی لەگەڵ بیرو باوەڕی ئیسلامیدا.

هەرچەند خەلافەتی عوسمانی «١٢٨٨-١٩١٤ز» لە ماوەی شەش سەدەی حوکمڕانیدا، ئیدیعای دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامی دەکرد و چەندین لەشکرکێشی و شەڕی بەناوبانگی لەدژی نەیاران و دوژمنانی ئەدینە و بە مەبەستی بەرینترکردنی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی (قەڵەمڕەو) ئەنجامدا، بەڵام ئەم ئیمپراتورییەتە لە لایەن زۆربەی موسوڵمانانەوە بەلادەر لە ڕێگای ئیسلام و دینی خوداوەند حیسابی بۆدەکرا و سەرئەنجامیش بە هۆی پشتیوانی نەکردنی موسوڵمانان لێی بەرە و لاوازی ڕۆیشت و هەرەسی هێنا. بۆیە لە سەردەمی حوکمڕانی ئەوخەلافەتەدا چەندین حەرەکەتی فەندەمێنتالیانەی ئیسلامی شکڵی گرتوو دوای ڕووخانی عوسمانییەکانیش ئەم حەرەکەتانە بەردەوامکران، کەسانی وەك: «محمد بن عەبدولوەهاب ١٧٠٣-١٧٨٢م»» «سەیدجەمال ئەلدین ئەسەدئابادی ١٨٣٨-١٨٩٧م»» «محمد عەمارە ١٨٤٩-١٩٠٥م»» «ئیقبال لاهوری ١٨٧٣-١٩٣٨ م» و...لە چەندین قۆناغی مێژوویی جیاوازدا بیرو بۆچوونی فەندەمێنتالییان خستەوە بەرباس و بەکردەوەش هەوڵی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامییاندا. لەماوەی ئەو ساڵانەدا کەدنیای ئیسلام تووشی

شکستی گەورە هاتبوو و نائومێدی و بێ هیوایی موسوڵمانانی داگرتبوو، جارێکی تر پێویستی گەڕانەوە بۆ لای بنەماکانی ئیسلام هاتە ئاراوە و کۆمەڵگای ئیسلامییش وەك سالآن و سەدەکانی ڕابردوو یەك وڵامی بۆ ئەم هەلومەرجە نالەبارە پێ بوو: **بەدواداچوونی ئیسلامی ڕاستەقینە و ئوسوڵە بونیادییەکانی.** ئەم گەڕانەوەیە لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە پێی‌نایە قۆناغێکی نوێوە و بزووتنەوەیەکی فەندەمێنتالی ئیسلامی لێکەوتەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا بەئیستا ئەم بزووتنەوەیە بەشێك لەدنیای ئیسلامی خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە و ڕەنگ و فۆرمی توندڕەوانەتر و دەمارگرژانەتری بەخۆوەگرتووە.

لەگەڵ ئەوەدا کە بزووتنەوەی فەندەمێنتالی ئیسلامی بەگشتی و بەتەواوی لق و پۆپەکانییەوە خاوەن یەك جۆر بیرکردنەوە و یەك بنەمای فکری و ئایدۆلۆژیکیە بەڵام لەبواری کردەوەدا ئەم بزووتنەوەیە بەدوو لایەن دابەش دەبێت: لایەنێکیان جیهادییەو باوەڕی بەنواندنی توندوتیژییە لە بەرابەر بەرەی بەناو کوفردا و لایەنەکەی تریش بەشێوەیەکی لیبراڵانەتر بیردەکاتەوە و کارەکانی ڕادەپەڕێنێت. بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی خاوەن چەند تایبەتمەندی گشتییە کە بەم شێوەییەی خوارەوەن:

**١- چەند سەنتەریبوون**

**٣ - بەربڵاوی**

**٢- بەردەوامی**

**بەربڵاوی**، بەومانایەیە کە هەرکام لە لایەنە ئیسلامییەکانی سەر بە بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی لە قەوارەیەکی پان وبەرینی جوگرافیایدا نفووز و تێکۆشانیان هەیەو لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا خاوەن پێڕەو و لایەنگرن. بزووتنەوەی نوێی‌ئیسلامی تایبەت بە چین وتوێژێکی نێوکۆمەڵگا نییە و هەموو

جۆرە خەڵکێك تیایدا بەشدارن. ئەگەرچی پشتیوانانی ئەم بزووتنەوەیە زۆرتر خەڵکانی هەژار و کەم داهات یان چین وتوێژی مامناوەندین بەڵام نیشانەگەلی پەرەسەندنی ژیانی ئیسلامی (فەندەمێنتال) لەنێو چینی دەوڵەمەندو سەرەوەی کۆمەڵگادا ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم جۆرە خەڵکانەش بەشداریی بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی دەکەن و یارمەتی گروپ و تاقمە توندڕەوەکان دەدەن.

**چەند سەنتەریبوون،** بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی لە گەڵ ئەوەدا کەخاوەن یەك سەرچاوەی فکری و ئایدۆلۆژیکییە، چەند لایەنی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە و سەدان گروپ و تاقم و ڕێکخراوی ئیسلامی لەخۆی دەگرێت. تەواوی ئەم لایەن و گروپ و تاقمانە بەجۆرێك هەوڵی گەڕانەوە بۆ لای بنەماکانی ئیسلام و زاڵکردنی شەریعەت لەوڵات و کۆمەڵگای ئیسلامی و تەنانەت هەموو دنیادا دەدەن بەڵام چۆنییەتی و شێوازی گەڕانەوەکەیان جیاوازی هەیە و ئەم جیاوازییەش وایکردووە کە بزووتنەوەی نوێیئیسلامی نەبێتە خاوەن سەنتەرێکی تایبەت و تاقانەی سەرپەرشتی و ڕێبەریکردن. هەرچەند لە دەیەی ڕابردوودا کەسانی وەك «ئوسامە بن لادەن» بانگەوازیان بۆ دروستکردنی بەرەیەکی جیهادیی جیهانی کردو ویستیان هەموو پێڕەوانی فەندەمێنتالی ئیسلامی لە دەوری یەك کۆبکەنەوە، بەڵام بانگەوازەکەیان ڕەتکرایەوە و بەشێکی زۆر لە لایەنە ئیسلامییەکانی ناو بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی پێی ڕازی نەبوون.

**بەردەوامی،** بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی لەماوەی سەدەی ڕابردوودا، دەریخستووە کە بەردەوامی و بەرە و پێشچوون تایبەتمەندییەکی هەمیشەییەتی و نیشانیداوە کە لەکاتی پێویستدا و لە هەلومەرجی لەباردا سەرهەڵدەدات. لە ڕاستیدا ئیسلام لە بەرابەر ئەو گۆشەگیر کردن و لە خۆخزانەدا کە دنیای ڕۆژئاوا مەسیحیەتی پێ خانەنشین کرد، بەربەرەکانی کردووە و تەنانەت هەوڵی زاڵکردنی خۆی داوە، لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا ئەم بەربەرەکانیە لە بەرابەر سیایەتی

جیاوازی دین لە دەوڵەتدا پەیڕەو دەکرێت و گروپ و تاقمە توندڕەوە ئیسلامیەکانی بەگژ دەسەڵاتی ناوەندیدا کردۆتەوە.

بەردەوامی ئەم ڕەوتە لە سەدەی ڕابردوودا، چەند ڕووداوی گرنگی بەسوود و بەقازانجی دنیای ئیسلام لێکەوتۆتەوە و خودی ئەم ڕووداوانەش بوونە هۆی بەردەوامی زیاتری ڕەوتی ئیسلامخوازی و گوڕ و تینێکی زۆرتریان بەخشیە بزووتنەوەی فەندەمێنتالی ئیسلامی، سەرەکیترینی ئەو ڕووداوانە بریتین لە:

- هاتنە سەرکاری ڕژێمی ئیسلامی لەئێران (١٩٧٩ م)
- جیهادی ئیسلامی ئەفغانستان (١٩٧٩-١٩٨٩ م)
- دروستبوونی ئیخوان ئەلموسلمینی میسر (١٩٢٨م)
- سەرهەڵدانی بزووتنەوەی تالیبان و دامەزرانی ئیمارەتی ئیسلامی لە ئەفغانستان (١٩٩٦ م)
- دەرکەوتنی تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدە (١٩٨٨م)

هاتنە سەرکاری ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران (١٩٧٩)،یەکێکە لەو ڕووداوە گرنگانەی کە لە سەرەتای هەشتاکاندا و لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا گەلێك سەرهەڵدان و ئاڵ و گۆڕی بەدوای خۆیدا هێنا و بوو بە هۆی گەشەکردنی هەرچی زیاتری فەندەمێنتالیی ئیسلامی لە جیهاندا. ئەگەرچی ئیخوان ئەلموسلمین دوای دامەزرانی، لە میسر و وڵاتانی ئیسلامیدا زۆر هەنگاوی بەرە و پێشی ناو لایەنگران و پیڕەوانی زۆری پەیدا کرد بەڵام سەرکوتی ئەم ڕێکخراوە لەلایەن دەسەڵاتی وڵاتانەوە ئاستی خۆشەویستی و پێگەی جەماوەری دابەزاند و تووشی قەیرانێکی نێوخۆیی کرد. بەردەوامی ئەم حاڵەتە بووە هۆی جیابوونەوەی گروپ وتاقمی جۆرا وجۆر لەو ڕێکخراوە و بە هاتنە سەرکاری ڕژێمی ئیسلامی لە ئێرانیش خەڵکانێکی زۆرتر لە تەنزیماتی ئیخوان ئەلومسلمین دابڕان، (الجیهاد) لە

زومرەی ئەو تاقمانە بوو کە دوای دابڕانی لە ئیخوان ئەلوموسلمینی میسر، ڕێبازێکی ڕادیکاڵ و جیهادیی بۆ خۆی هەڵبژارد و کەوتە تەکفیرکردنی خەڵکانی تر. لەو سەردەمەدا هێزی تازە پێگەیشتوو و جەوانی موسوڵمان لایەنگری ئەو ئەندیشە ئیسلامییە شەڕانگێزانەیە بوو کە ڕژێمی ئیسلامیی تازە بەدەسەڵات گەیشتوو لە ئێران، پێڕەویی دەکرد. کاریگەری ئەو نیزامە دینییە خۆسەپێنەرە بێجگە لە میسر، وڵاتانی: سوریا، عێراق، عەرەبستان، کوێت، بەحرەین، ئەلجەزائیر، تونس، لوبنان، گرتەوە و بوو بەهۆی سەرهەڵدانی گروپ و تاقمی توندڕەوی ئیسلامی لەو وڵاتانەشدا.

لەو سەروبەندەدا ئەفغانستان بووبوو بە خانەخوێی ئەو موجاهیدانەی کە بۆ بەشداریکردنی جیهاد دژی هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت چووبوونە ئەو وڵاتە، بەردەوامی جیهاد بۆ ماوەی دەیەیەك وخۆڕاگری بەرەی جیهادیی لە بەرابەر ئەرتەشی سووردا بوو بە تەجروبە و ئەزموونێکی باش بۆ توندڕەوە ئیسلامییەکان و تووشی جۆرێك لەخۆبایی بوون و غووروری کردن. ئەم لەخۆبایی‌بوونە، پێڕەوانی بونیادگەری ئیسلامی هاندا بۆ بەردەوامکردنی جیهاد لە پێناو دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامدا و سوورتری کردن لەمەڕ بەدواداچوونی بیر و بۆچوونە بونیادگەرایانەکانیان. بەگژاچوونەوەی ئەمجارە تایبەت بە وڵاتێك یان لایەنێکی داگیرکەر نەبوو و تەنیا سەلیبییەکان و رۆژئاواییەکانی نەدەگرتەوە، ئەم بەگژاچوونە بریتی بوو لە ڕاگەیاندنی جیهاد لە دژی هەمووخەڵکی دنیا و سەرجەم بەرەی پێشکەوتنخواز، بریتی بوو لە کوشتن و سەربڕینی خەڵکی سڤیل ومەدەنی لە هەموو شوێنێکی جیهاندا تەنانەت لە وڵاتانی ئیسلامیدا. (بەگژاچوونەوەیەك پڕ لە کاری تیرۆریستی و شەڕئەنگێزی)

تۆڕە تیرۆریستییەکەی ئوسامە بن لادەن ئەو شانازی و ئیفتخارەی پێ بڕاوە کە ڕێبەریی ئەم بەگژاچوونەوەیەی کەوتۆتە ئەستۆ و بووە بە پێشڕەوی ئەو بزووتنەوە ئیسلامیە جیهادییەی کە ئەمڕۆکە هەموو دنیادی داگرتووە و بووە بە

هەڕەشەیەکی گەورە بۆسەر پێشکەوتن و ئازادی و ئاسوودەیی ئینسانەکان. لە کۆتاییەکانی جیهادی ئیسلامی ئەفغانستاندا (١٩٨٨م) و بەتێکەڵبوون و یەکگرتنی گروپە توندڕەوەکەی ئوسامە بین لادەن و تاقمی (الجیهاد)ی سەر بە ئیمەن ئەلزەواهیری، ڕێکخراوی ئەلقاعیدە دامەزرا. دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی تالیبان و پێکهاتنی ئیمارەتی ئیسلامی ئەفغانستان، ئەم ڕێکخراوە بنکە و بارەگاکانی خۆی لەو وڵاتەدا کردەوە و داوای لە موسوڵمانانی جیهادیی کرد کە بۆ ڕاهاتنی عەسکەری سەردانی ئەفغانستان بکەن. دامەزرانی ئیمارەتی تالیبان و دروستبوونی تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدە جارێکی تر شادی و خۆشی خستە نێو لایەنگرانی بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی و مەیلی ڕۆیشتن بەرەو سەرکەوتنی ئێجگارەکی و دابەزاندنی شەریعەتی‌ئیسلامی لابەرز کردنەوە.

ئەلقاعیدە توانی لە ژێر سێبەری ئیمارەتی ئیسلامی قەندهاردا خۆی بەهێزتر بکات و وەك ڕێکخراوێکی تیرۆریستی‌دایك، لە ئەفغانستانەوە ڕێبەریی گروپ و تاقمەکانی سەر بەخۆی لە هەموو شوێنێکی دنیادا بکات. ئوسامە بین لادەن و گەورە بەرپرسانی ئەم ڕێکخراوە لەو باوەڕەدا بوون کە ئەتوانن لە وڵاتێکی دواکەوتوو بەلالێدراوی وەك ئەفغانستانەوە ولە سایەی دەسەلاتێکی کۆنەپەرەستی وەك ئیمارەتی تالیباندا پیلان بۆ لێدان و زەربە وەشاندن لە دوژمنانی خۆیان لە هەموو شوێنێکی دنیا و بەتایبەت لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دابڕێژن و ئەفغانستان بکەن بە دەروازەیەك بۆ ئازادیی هەمووجیهان لە دەستی کافران و نەیارانی ئیسلام! بە پێچەوانەی ئەم هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوە هەڵەیە و دوای جێبەجێ کردنی یەکەم پیلان، وەزعەکە بە ئاراستەیەکی تردا ڕۆیشت و ئەوەی کە بەعەقڵی ئەواندا نەدەهات و بیریان لێنەدەکردەوە بوو بە ئەمری واقیع، پاش هێرشە تیرۆریستییەکەی یازدەی سێپتەمبەری (٢٠٠١ز) بۆ سەر هەردوو باڵەخانەی بازرگانی جیهانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئاشکرابوونی ڕۆڵ ودەستی تۆڕەکەی ئوسامە بن لادەن لەو هێرشەدا، هەڵمەتێکی تۆڵە

کردنەوەی کوتوپڕ کرایەسەر ئەفغانستان و بنکە و بارەگاکانی ئەلقاعیدە و تالیبان لە و وڵاتە کەوتەبەر پەلاماری ئامریکا و هاوپەیمانەکانی، دوای ماوەیەکی کورت و بەهۆی کاریگەری ئەو هێرشە دەسەڵاتی مەلا عومەر ڕووخا و ئوسامە بن لادنیش بەسواری کەرێکی سپی ئەفغانستانی بەجێهێشت.

دروستبوون و سەرهەڵدانی ئیمارەتی تالیبان و تۆڕی ئەلقاعیدە، لە کاتی خۆیدا هەموو موسوڵمانە سەلەفی و توندڕەوەکانی دنیای شاگەشکە کرد و هیوا و ئومێدێکی زۆری بەخشیە سەرجەم پێڕەوانی فێندەمێنتایزمی ئیسلامی، لە ماوەی ساڵانی دەسەڵاتدارێتی تالیبانـدا لە ئەفغانستان، ئەو وڵاتە بوو بە قیبلەیەکی نوێ بۆ بەشێکی زۆر لە دونیای ئیسلام و زۆربەی ئەوکەسانەی کە بیری توندڕەوی و فێندەمێتالیزمی بەسەریاندا زاڵبوو ڕوویان کردە ئەم قیبلەیە، بۆیە ڕووخانی کوتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوی ئەو ڕژێمە و شپرزەبوونی تۆڕی ئەلقاعیدە و هەموو خۆشی و ئاوات و ئارەزووەکانی پێڕەوانی ڕادیکاڵیزمی ئیسلامی کردە بڵقی سەرئاو. ئیسلامییە توندڕەوەکان و پاشماوەکانی ئەلقاعیدە و تالیبان، پاش ئەم دارمان و دارووخانە، بۆ قەرەبوو کردنەوەی شکستەکانیان و بەرزکردنەوەی ورەی لایەنگرانیان، دەستیان دایە ئەنجامدانی هەرجۆرە کارێکی تیرۆریستی. ئەوەی کە ئەمڕۆ لە عێراق و شوێنەکانی تری دنیادا و بە شێوەی ڕۆژانە ڕوودەدات درێژەی ئەو سیاسەتە دوژمنکارانەیەی ڕادیکالیزمی ئیسلامییە کە بە توندوتیژی لەدژی مرۆڤە بێ تاوانەکان و بەرەی پێشکەوتنخواز بەرێوە دەچێت. هەنووکە زیاتر لەسەد گرووپ و تاقمی ئیسلامی لە دنیادا هەلسوڕان و چالاکییان هەیە کە ژمارەیەکی زۆریان پشتیان بە کاری تیرۆریستی و توندوتیژی بەستووە، هەمووی ئەو گروپانە گەڕانەوە بۆ بنەماکانی ئیسلام و دابەزاندنی شەریعەت بە خواستی سەرەکی خۆیان دەزانن و جیهاد بە تەنیا ڕێگای گەڕانەوە و گەیشتن بەو خواستە دادەنێن. ئەوان ئامادەن لەپێناو گەیشتن بە خواستەکانیان گیانی خۆیان ببەخشن و کردەوەی خۆکوژی ئەنجام بدەن، حازرن

له هەر شوێنێك و له هەركات و ساتێكدا جەستەی خۆیان پارچە پارچە بكەن یان سەری خەڵكی بێ تـاوان و هاورەگـەزو هاوزەمـان و تەنانـەت هـاودینی خۆیـان لێبكەنەوە.

بەربەرەكانی لەگەڵ تیرۆریزمی ئیسلامی و ڕێگرتن بە دیاردەی ترسناكی تـیرۆر و تۆقاندن، ئەركی هەموو ئینسانێكی دەروەست و دڵسۆزە و پێویستی بە لێـبڕان و هەست بە مەسئولییەت كردنی زیـاتر هـەیـە. ناسـینی گـرووپ و ڕێكخـراوە تیرۆریستییەكان و ئاگاداربوون لـە جموجـووڵ و هـەڵـسووكەوتیـان، ئـەتوانێـت هەنگاوێك بێت له پێناو بەگژاچوونەوەی باشتر و كاراتری تیرۆر و تیرۆریـستاندا و هەوڵێك بێت بۆدەرخستنی سیمای ڕاستەقینەی ئیسلامی سیاسی و ڕادیكاڵ، بەو نییەتە و لەم پێناوەدا دەست دەدەمە ناساندنی گروپ و تاقمگەلی فەندەمێنتالی سوننە له ولاتی ئێران و چۆنیەتی سەرهەڵدانی بیری سەلەفیگەریتان لـەو ولاتـەدا بۆ شیدەكەمەوە.

سینا م

سلێمانی ٢٠٠٦.

## تێبینی

بەهۆی ئەوەی لە پێوەندی لەگەڵ بابەتی ئەم کتێبەدا نوسراوە و سەرچاوەیەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە، بەناچار بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکان و ئاگاداربوون لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی فەندەمێنتالی ئیسلامی سوننە لە ناوچەکانی کوردستان و بەلوچستانی ئێران، پشت ئەبەستم بەو زانیاریانەی کە لەمەلاولا لە لایەن خەڵکی باوەڕپێکراوەوە بەدەستم هێناون.

بۆ ئەوەی خۆم تووشی درۆ نەکەم و خوێنەریش بەهەڵەدا نەبەم بەناچار هەوڵەکانم چەند بەرابەر کردەوە و ماوەیەکی زۆرتر بە کۆکردنەوەی زانیاریەکان و نیزیکبوونەوە لە ڕاستییەکانەوە خەریکبووم. جگە لەو زانیارییە زارەکیانەی کە کەڵکم لێوەرگرتوون، چەندین کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەش بوون بەسەرچاوە و تەواوکەری زانیاریەکان.

لەم کتێبەدا، مەبەست لە «بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی» ئەوجەرەکەت و جوولانەوە ئیسلامییەیە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا بە ئێستا بەشێکی زۆری دنیای ئیسلامی لەگەڵ خۆی خستووە و بۆ دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام تێکۆشاوە، ئەم بزووتنەوەیە سەرجەم ئەو گروپ و تاقمانە لە خۆ دەگرێت کە لە ماوەی سەد ساڵی ڕابردوودا دەرکەوتووون و پێڕەوییان لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی سیاسی کردووە. بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی لە لای لایەنگران و ڕەخنەگرانی بەچەند ناوی ترەوە ئەناسرێت کە ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکیانن:

(بعثـه الإسلامية، رينسانسی ئيسلامی)، (صحوه الإسلامية، ڕابوونی ئيسلامی)، (احياءالدين، ژيانەوەی دين)، (اصوليه الإسلامي، فەندەمێنتالی ئيسلامی) ئەوەی کە شیاوترە و پێوەندییەکی نیزیکتری بە نێوەرۆکی بزووتنەوەی

نوێی ئیسلامییەوە هەیە (اصولیە الإسلامیة یا فەندەمێنتالی ئیسلامییە)، بۆیە ئێمەش لەم کتێبەدا هەمان ناومان بەکار هێناوە.

لایەنگران و پێڕەوانی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی خۆیان بە (إسلامیە، ئیسلامخواز. ئیسلامگەرا) یا (اصولیین، فەندەمێنتالیزمەکان) ناودەبەن و منیش ئەو ناوانەم بەهەمان مانـاوە بەکارهێناوە. لە پێوەندی لە گەڵ لایەنە ئیسلامیەکانیشدا و بەنیسبەت قەبارەیانەوە، تۆڕ، ڕێکخراو، گروپ، تاقم، سازمان یا تەنریمات لە پاڵ ناوەکان دانراوە.

## ناوچەسوننەنشینەکانی ئێران

لە چوارچێوەی ئەو جوگرافیایەدا کە ئێرانی پێ دەوترێ، چەندین میللەت و نەتەوەی جۆراوجۆر نیشتەجێن کەهەرکامیان خاوەن کولتوور، فەرهەنگ و ئاییني تایبەت بەخۆیانن. دوای زۆرینەی شیعە مەزهەب کە ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوانی ئێران پێك دەهێنێت، سوننەکان بەپلەی دووهەم دێنەوە و مەزهەبی سوننە بە مەزهەبی دووهەمی وڵات دادەنرێت. هەرچەند تائێستا و لە سەرژمێرییە ڕەسمیەکانی وڵاتی ئێراندا «شاخصی» مەزهەبیان نەگونجاندووە و ڕادە و ڕێژەی پێڕەوانی مەزهەبی شیعە، سوننە یا کەمایەتییەکی تری مەزهەبی دەرنەکەوتووە بەڵام بە پێی ڕاوبۆچوونی چالاکانی سیاسی و مەزهەبی و ئە وتوێژینەوانەی کە ئەنجامدراون، سوننەکان١٥-٢٠ لە سەدی دانیشتوانی ئێران یان ١٠-١٥ ملیۆنی حەشیمەتی ئەم وڵاتە پێك دەهێنن.

پێڕەوانی مەزهەبی سوننە لە نێو نەتەوەکانی کورد، تورکمەن، بەلووچ، عەرەب، تالشی و.....دا بەدی دەکرێن و لە چەندین ناوچەی جوگرافیاییدا کە زۆرتر سنووری و دوور لە ناوەندن نیشتەجێن. لە دوورترین ناوچە سنوورییەکانی

ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە، بەلووچستان و سنووری پاکستان تالێوارەکانی دەریای عەمان و چابەهار و لە ناوچە سنووریەکانی ڕۆژئاوای وڵاتیشەوە، ماکۆ و ورمێ تا دەوروبەری کرماشان و لەوێشەوە تا چەند ناوچەیەکی خوزستان، هورموزگان، فارس، هەروەها بەشێك لە پارێزگای گوڵستان و ناوچەی تاڵش لە باکووری ئێران، پێڕەوانی مەزهەبی سوننە ژیان بەسەردەبەن و نیزیك بە نیو ملیۆن خەڵکی سوننەش لە شاری تاران دادەنیشن. سەرەڕای ئەوەی کە بەدرێژایی مێژووی موسوڵمان بوونیان، عیرفان و (تصوف) لە گەل ژیانی ئەهلی سوننەی ئێراندا تێکەڵبووە و نەیهێشتووە کە بیروباوەڕی ئەوان ببێتە دەستاژۆی تەعبیر وتەفسیری توندڕەوانە و سەلەفیانە لە مەزهەب، دیسان پێڕەوانی ئەم مەزهەبە نەیانتوانیوە لە ژێر کاریگەری بزووتنەوەی نوێیئیسلامی دەربچن . هەرچەند مێژووی ئەو کاریگەرییە ئەگەرێتەوە بۆ چەن دەیە لەوە و پێش (بەر لە شۆڕشی ئێران. ١٩٧٩ ز) بەڵام ئاسەوارە عەینی و ئاشکراکانی، دوای شۆڕش دەرکەوتوو و دروستبوونی گروپ و تاقمی بونیادگەرای ئیسلامی لێکەوتەوە.

## دروستبوونی ڕێکخراوی ئیخوان ئەلموسلمینی میسر (١٩٢٨م)

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا و لە ژێر کاریگەری ئەو پێشکەوتنانەدا کە دنیای ڕۆژئاوای گرتبووەبەر، خەڵکی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیش کەوتنە خۆو جموجوولێکی نوێخوازانەیان لە بوارگەلی جۆراوجۆردا دەستپێکرد. میسر یەکێك لەو وڵاتانە بوو کە زۆر زوو ئەم جموجوولە تیایدا دەستی پێکرد و لەدوای شەڕی دووهەمی جیهانییەوە گوڕ و تینی زیاتری بەخۆوەگرت. دروستبوونی کۆڕ و کۆمەڵ و ڕێکخراوی مەدەنی، بایەخدان بە ئازادی ژن، ڕۆیشتن بەرە و خوێندنی ئاکادیمیك و ....لەو بەرهەمانەن بوون کە ڕەوتی پێشکەوتنخواز پێشکەشی کۆمەڵگای

میسری دەکرد و ئەم ڕەوتە بەرە و تازە کردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی لەو وڵاتــەدا هەنگاوی دەنا.

ترس لە گەشەکردن و پەرەسەندنی بزاڤی نوێگەرا و پێشکەوتنخواز، ڕێبەرانی ئایینی میسری هاندا بۆ ئەوەی بکەونە خۆیان و بیر لە پەکخستنی ئەم ڕەوتە بکەنەوە. ئەوان کە بیر و باوڕێکی دەق بەستووی ئایینی بەسەریاندا زاڵبوو و بەرژەوەندی خۆیان لە دواکەوتوویی خەڵك وکۆمەڵگادا ئەبینیەوە دەستیاندایە دژایەتیکردنی هەرجۆرە حەرەکەتێکی نوێخوازانە و خەڵکیان بۆ پێشگرتن بەو ڕەوتە هاندەدا. سەرئەنجام، بەردەوامی هەوڵ و هەڵمەتی پێشکەوتنخوازانە و دەسکەوتە یەك لەدوای یەکەکانی، ڕێبەرانی ئایینی میسری گەیاندە ئەو قەناعەتە کە دەستبدەنە دروستکردنی ڕێکخراوێکی ئیسلامی و بیکەن بە دژەهێزێك بۆ بەگژاچوونەوەی بەرەی پێشکەوتنخواز. (حسن البناء) و شەش کەس لە هاوبیرەکانی دوای کۆبوونەوەیەك لە شاری ئیسماعیلییە(١٩٢٨ز)، بەدەرکردنی ڕاگەیەندراوێك دامەزرانی ئەم ڕێکخراوەیان ڕاگەیاند و نێوی ئیخوان ئەلموسلمینیان لەسەردانا. پاش ئەوەی کە بیر و بەرنامەکانی ئیخوان بە هەموو شار و دێهات و ناوچەکانی میسردا بڵاو بووەوە و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك و تولابی ئایینی بەیعەتیان لەگەلکرد، ناوەندی سەرەکی ئەم ڕێکخراوە گواسترایەوە بۆ شاری قاهیرە و لەوێوە هەڵمەتێکی چڕوپڕی تەبلیغی و داوەتکردن دەستپێکرد.

ئیخوان ئەلموسلمین دوای ئەوەی کە بوو بە ڕێکخراوێکی تــا ڕادەیــەك بــەهێز و پڕجەماوەر لە میسردا، شان بەشانی دەسەڵاتی پاشــایەتی و هێــزە دەرەکییــەکان کەوتە بەربــەرەکانی و دژایــەتیکردنی بــەرەی پێــشکەوتنخواز و بووبــە ڕێگــر و

لەمپەر لەبەردەمیدا و نەیهێشت بەوجۆرەی کە پێویستە ئەو وڵاتە پێشکەوتن بەخۆوە ببینێت.

ئەم ڕێکخراوە پاش ئەوەی کە توانیبووی لە نێوخۆی میسردا سەرکەوتنی باش بەدەست بێنێت و جەماوەرێکی زۆر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، هەوڵی بەزاندنی سنوورەکانی میسری داو لە دەرەوەی ئەو وڵاتەش کەوتە بانگەشەی بیری بونیادگەری ئیسلامی. ڕێبەرایەتی ئیخوان، بە دروستکردنی بەشێکی تەبلیغی گەڕۆك و ناردنی بۆ وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، دەستیدایە تەبلیغی بەرنامە و سیاسەتەکانی و سەرنجی موسوڵمانانی بۆلای خۆی ڕاکێشا، بەردەوامی ئەم تەبلیغ و بانگەشە کردنە جموجوولێکی نوێی ئیسلامیگەری لەو وڵاتانەدا لێکەوتەوە و هەزاران کەس بوون بە پێڕەوی ڕێگە و ڕێبازی بونیادگەری ئیسلامی.

ئیخوان ئەلموسلمین وەك یەکەم شەپۆلی ئیسلامیسیاسی لە دنیای هاوچەرخدا، بوو بە دایکی ئەو ڕەوتە نوێیەی کە لە ساڵانی دواییدا بزووتنەوەیەکی فەندەمێنتالی ئیسلامی لێکەوتەوە، هیچ گروپ و ڕێکخراوێکی ئیسلامی نییە کە لەو دواییانەدا سەری هەڵدابێ و نەکەوتبێتە ژێر کاریگەری بیر و بۆچوونی ئیخوان ئەلموسلمین و ئەندیشە وئەفکاری ڕێبەرانی ئەم ڕێکخراوەوە.

### کاریگەری ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانی لە سەر سوننەکانی ئێران

بە بڵاوبوونەوەی سیاسەت و بەرنامەکانی ئیخوان ئەلموسلمین بە وڵاتانی ئیسلامیدا، سوننەکانی ئێرانیش لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە لە گەلی ئاشنابوون و کەوتنە پێڕەوی و لایەنگری کردنیان، ئەم ئاشنا بوونە نەگەڕێتەوە بۆ دەورانی دەسەڵاتی پاشایەتی لە ئێراندا و لە دوو ڕێگاوە زەمینەی بۆ فەراهەمبوو:

**یەکەم**، لە ڕێگای پرۆسەی حەجەوە و بەهۆی ئەو کەسانەوەوە کە سەردانی سەرزەمینی حیجازیان دەکرد، نوێنەرانی ئیخوان ئەلموسلمین لە کاتی بەڕێوە چوونی پرۆسەی حەجدا ئەنێردرانە عەرەبستان و لەگەل حەجاجدا پێوەندییان دەگرت و بە بەرنامە و بیر و بۆچوونەکانی خۆیان ئاشنایان دەکردن. ژمارەیەك لەو ئێرانییە سوننە مەزهەبانەی کە لەو ساڵانەدا بەشداریی پرۆسەی حەجیان دەکرد ئەکەوتنە ژێر کاریگەری ئەم بەرنامە نوێیە و پاش گەڕانەوەیان بۆ وڵات دەستیان دەدایە تەبلیغ و خەڵکیان بۆ لایەنگری و پێڕەویکردن لە مەرام و سیاسەتەکانی ئیخوان ئەلمسلمینی جیهانی هاندەدا.

**دووهەم**، لە ڕێگای وڵاتی عێراقەوە و بەهۆی ئەو پێوەندییانەی کە لەو سەردەمەدا لە نێوان کۆمەڵی سوننەی ئێرانی وعێراقیدا بەرقەراربوو، ئەم ڕێگایە زۆرترین کاریگەری لەسەرسوننەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان دانا و بیری فێندەمێتالی ئیسلامی و بۆچوونەکانی ڕێکخراوی ئیخوان ئەلموسلمینی پێگەیاندن. عێراق وەك دراوسێیەکی ئێران و وەك وڵاتێکی ئیسلامی کە ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی پێڕەوی مەزهەبی سوننەن لە یەکەم ساڵانی دوای دامەزرانی ئیخوان ئەلموسلمینەوە بوو بە مەیدانێکی باش بۆ تەبلیغ و بانگەشەی بیر و بەرنامەکانی ئەم ڕێکخراوە، پاش ماوەیەکی زۆر کاری تەبلیغی و داوەتکردن، سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٤٦ زاییندا یەکەم تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلمسلمین لەو وڵاتە دامەزرا. لە ماوەی چەندین ساڵ کار وتێکۆشانی ئاشکرا و نهێنیدا، بە سەدان کەس بوون بە ئەندام و لایەنگری ئەو تەنزیماتە و ژمارەیەکی زۆریش لە تەلەبە و مامۆستایانی ئایینی باشووری کوردستان پێوەندییان پێوەکرد، لەو سەردەمەدا کۆلیژی شەریعەی جامیعەی بەغداد بووبوو بە شوێنی ناساندنی بیری فێندەمێتالی ئیسلامی و بەرنامە و سیاسەتەکانی ئیخوان

ئەلموسلمینی تیادا تەبلیغ دەکرا. ئەو تەلەبە کوردانەی کە لەو کۆلیژەدا خەریکی خوێندنی ئایینی بوون زۆربەیان ئەکەوتنە ژێر کاریگەری بیر و باوڕی نوێی ئیسلامی و دوای گەڕانەوەیان بۆ کوردستان ئەبوون بە موبەلیغی ئیسلامی سەلەفی وفێندەمێنتال، بەردەوامی ئەمجۆرە تەبلیغاتە و پتەوبوونی پێوەندی نێوان بونیادگەرای کورد و عەرەب بووە هۆی ئەوەی کە لە ساڵی١٩٥٢ ز دا یەکەم تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمین لە باشووری کوردستان و لە شاری هەڵەبجە دابمەزرێت. دروستبوون و دەستبەکارکردنی ئەم تەنزیماتە، هەوڵێکی چڕوپڕی تەبلیغی بەدوای خۆیدا هێنا و بووە هۆی ئەوەی کە دەیان کەس لە ناوچە جۆرا و جۆرەکانی کوردستان بکەونە پێڕەویی کردنی بەرنامەکانی ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانی. گەشەکردن و بەهێزبوونی فێندەمێتالیزمی ئیسلامی لەم ناوچانە و زۆربوونی خێرا و کوتووپڕی پێڕەوان و لایەنگرانی بیر و بۆچوونی نوێی ئیسلامی، سەرنجی ئیخوان ئەلموسلمینی عێراقی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و مەشروعییەتی زۆرتری بەخشییە تەنزیماتی سەر بەم ڕێکخراوە لە باشووری کوردستان. ساڵی ١٩٦٠ی زایینی، حیزبی ئیسلامی عێراقی دامەزرا و وەك نوێنەری ڕەسمی ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانی دەستی بەکار کرد، دوو مامۆستای ئایینی کورد کە پێشتر بەیعەتیان لەگەڵ ڕێبازی ئیخوان ئەلموسلمیندا کردبوو، بە نوێنەرایەتی تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمینی باشووری کوردستان و وەك ئەندامی ئەم حیزبە هەڵبژێردران کە بریتیبوون لە:

### مامۆستا عوسمان عەبدولعەزیز و مەلا محەممەدی خورماڵی

حیزبی ئیسلامی ئێراقی بۆماوەی دەیەیەك لە کار و تێکۆشان بەردەوام بوو ولە بەرە و پێشبردنی سیاسەت و بەرنامەکانی ئیخوان ئەلموسلمین لەو وڵاتەدا ڕۆڵی

کارای گیّرا. لەساڵی ۱۹۷۱ی بەملاوە و بە هۆی گۆڕانی کەش و هەوای سیاسی عێراقەوە، ئەم حیزبە کەوتە ژێر گوشاری دەسەڵاتی ناوەندی و هەرجۆرە هەڵسووڕان و فەعالییەتێکی لیّ قەدەغەکرا، لە ساڵانی دواتردا و بەهۆی گیران و ئەشکەنجەدانی ژمارەیەك لە چالاکانی سەر بەم ڕێکخراوە، سەرئەنجام پاشماوەکانی حیزبی ئیسلامی عێراقی بەرەبەرە وڵاتەکەی خۆیان بەجێهێشت و پەنایان بۆ دەر و جیرانەکانی عێراق برد، زۆربەی پێڕەوانی ئیخوان ئەلموسلمینی باشووری کوردستانیش خۆیان گەیاندە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و دواتریش چوونە نێو ڕیزی موعارزەی عێراقییەوە.

لە ماوەی ئەوساڵانەدا و بە هۆی پێوەندی نێوان سوننەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتیکوردستان و لە ژێر کاریگەری ئەو پێشکەوتنانەی کە بزووتنەوەی بونیادگەری لە دنیای ئیسلام و وڵاتی عێراقدا بەدەستی هێنابوون، بیری بونیادگەرای ئیسلامی لە ناوچە سوننەنشینەکانی کوردستانی ئێرانیش زیاتر گەشەی سەند و ژمارەیەك پێڕەو و لایەنگری پەیدا کرد. ئەو تەلەبە کوردانەی کە لەم بەشەی کوردستانەوە و بە مەبەستی خوێندنی ئایینی ئەچوونە وڵاتی عێراق، لە حوجرە و خوێندنگەکاندا لەگەل ڕێبازی ئیخوان ئەلموسلمین ئاشنا دەبوون و پاش گەڕانەوەیان بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان، دەستیان دەدایە تەبلیغی ئەم ڕێبازە ئیسلامییە نوێیە و خەڵکیان بۆ پێڕەوی کردن و لایەنگری کردنی داوەت دەکرد. تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمینی باشووری کوردستان لە ماوەی ساڵانی بەردەوامبوون و تێکۆشانیدا توانی تەئسیرێکی زۆر لە سەر کۆمەڵی سوننەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دابنێت و ببێتە هۆی سەرهەڵدانی جموجوولێکی نوێی ئیسلامی لەم بەشەی کوردستاندا.

ئەم جموجوولە هەرچەند کز و لاواز و بە شێوەی نهێنی و شاراوە ئەچووە پێش، بەلاّم بەوجۆرە و تا سەروبەندی شۆڕشی جەماوەری ۱۹۷۹ گەلانی ئێران

بەردەوامکرا و دوای ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و خۆسەپاندنی دەسەڵاتی ئیسلامی پێی نایە قۆناغێکی نوێوە.

ئەگەرچی تێکۆشانی پێڕەوانی ب فێندەمێنتالی ئیسلامی لە ساڵانی بەر لە شۆڕشدا نەبووە هۆی دروستبوونی تەنزیمات و تەشکیلاتێکی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمین، بەڵام دوای شۆڕش و لە هەلومەرجی نوێدا ئەم ئاواتەی پێڕەوانی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی هاتە دیو یەکەم تەنزیماتی سەربەم ڕێکخراوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دامەزرا.

## هاتنە سەرکار و خۆسەپاندنی ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران ١٩٧٩

ئەو دەسەڵاتە ئیسلامییەی کە دوای ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و لە دەرفەتی لە باری دوای شۆڕشدا خۆی بەسەر ئێراندا سەپاند، دەسەڵاتێك بوو کە لە سەر بنەمای بیری فەندەمێنتالی شیعە دامەزرابوو و فکر و هزرێکی ئیسلامی بەسەریدا زاڵبوو. ڕێبەرانی ئەم دەسەڵاتە هەوڵی دابەزاندنی داب و نەریتەکانیان لە کۆمەڵگای ئێراندا دەدا و جگە لە بیر و باوەڕەکەی خۆیان هیچ دەنگ و ڕەنگێکی جیاوازیان پێ قەبووڵ نەبوو. ئەو هێزە ئازادیخواز و دیموکراتانەی کە ڕۆڵ و دەوری سەرەکییان لە ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتیدا گێڕابوو و خەمخۆری و ڕاستەقینەی گەلانی ئێران بوون لە بەر نەبوونی ڕێکەوتن و هەماهەنگی لە نێوانیاندا، نەیانتوانی لە کاتی پێویستدا بجوولێنەوە و بەر بەدامەزرانی ڕژێمی ئیسلامی بگرن. دوای ئەوەی کە دەسەڵاتی ئیسلامی کەوتە دژایەتیکردنی هەموو دەنگێکی ئازادیخوازانە و دەستیدایە سەرکوتی کەمایەتییە نەتەوەییەکانی ئێران، دەنگی نارەزایەتی لە بەرابەر ئەو ڕژێمەدا بەرز کرایەوە و نەتەوە بندەستەکانیش کەوتنە دیفاع لەمان و مەوجوودییەتی خۆیان.

ئەو دەنگە لە ناوچەکانی کوردستان و بەلووچستاندا زیاتر بەرز کرایەوە و هەر دوو میللەتیکورد وبەلووچ بۆ دەستەبەرکردنی مافە ڕەواکانیان، لە بەرابەر

سـەرکوت و دەسـتدرێژی ڕژێمـی ئیـسلامیدا ڕاوەسـتان و خۆڕاگریـان نوانـد. بونیادگەرای شیعەی تازە بەدەسـەڵات گەیـشتوو کـە لـە بنەڕەتـدا بـاوەڕی بـە مەسەلەی میللی و نەتەوەیی نەبوو هەوڵی سـەرکوتکردنی مـافخوازانی کـورد و بەلووچیداو پیلانی ڕەنگاوڕەنگی بۆ کپکردنی دەنگـی ناڕەزایـەتی لـە نێـو ئـەو گەلانەدا بەکار هێنا. یەکێك لەو پیلانانە ڕێکەوتنی تاکتیکیی ڕژێمـی ئیـسلامی بوو لە گەل پێڕەوانی بونیادگەرای سوننەی کورد و بەلووچ، دەسەڵاتی خۆسەپێنەر کە نەیدەتوانی لەو سەردەمەدا و بـە تـاقی تـەنیا بەسەرکێـشە نێوخۆییەکانـدا زاڵبێت و لـە بەرابـەر هـەردوو گـەلیکـورد و بەلووچـدا دەستەوەسـتان مـابوو، بەتەمابوو بە ڕێکەوتنی درۆیـن و شـانۆیی لەگـەل گـروپ و تاقمـە سـوننەکانی کوردستان و بەلووچستان، دژەهێزێك لە بەرابەر ئازادیخوازانی کـورد و بەلووچـدا دروستبکات. ئەم دژەهێزە بە پێی ئەو قەول و بەڵێنانەی کـە لـە لایـەن ڕژێمـی ئیـسلامییەوە پێـی درابـوو ئـەرکی بەگژاچـوونەوەی هێـزە ئـازادیخواز و نیشتمانپەروەرەکانی کەوتبووە سەرشـان و ئەبوایـە ئـەو هێزانـەی لـە مەیـدانی خەبات و تێکۆشاندا وەدەر بنایە . چەند خـاڵی هاوبەشـی نێوانفێنـدەمێتالیزمی شیعە و سوننە کە بووبوونە جەوهەری سەرەکی ڕێکەوتنی نێـوان ئـەم دوولایەنـە بریتیبوون لە:

**یەکەم**، بونیـادگـەرای سـوننە و تـاقم وگروپـە ئیـسلامییەکانی کوردسـتان و بەلووچستان، باوەڕیان بە ئیسلامی بوونی دەسەڵاتی تازە پێگەیشتوو لە ئێرانـدا بوو و مانەوە و بەردەوامی ئەو دەسەڵاتەیان بەلاوە گرنگ بوو، ئەوان ئامادەبوون بەجۆرێك لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەدا ڕێبکەون و بۆ هێشتنەوەی هەوڵ بدەن.

**دووهەم**، فەندەمێنتالیانی کورد وبـەلووچ، باوەڕیـان بـە مەسـەلەی میللـی و نەتەوەیی نەبوو و نەیاندەویست کە ئەم دووگەلـە بـە مافـە ڕەواکانیـان شـادبن،

ڕژێمی ئیسلامیش هەمان بیر و بۆچوونی بوو و ئامادەنەبوو کە لەگەل ئەو گەلانەدا ڕێبکەوێت و دان بە مافەکانیاندا بنێت.

**سێهەم**، پێڕەوانی فێندەمێتالیزمی ئیسلامی سوننە، هەموو ئەو حیزب و لایەنە سیاسیانەیان کە داکۆکیان لە مافە ئینسانی و نەتەوەییەکانیگەلانی کورد و بەلووچ دەکرد، بە کافر و دوژمنیخودا و نۆکەری بێگانە ناودەبرد. ئەوان بە دەسەلاّت گەیشتنی ئەو هێزانەیان بە پەرەسەندنی کوفر و فەساد و بێ ئیمانی دەزانی و ئەمەش هەمان دید و بۆچوونی ڕژێمی ئیسلامی بوو لەسەر ئەو لایەنانە.

ڕژێمی ئیسلامی کە بێجگە لە مەزهەبی شیعە باوەڕی بە هیچ مەرام و مەزهەبێکی تر نەبوو و نەیدەویست کە کەمایەتییە مەزهەبییەکانی ئێران بە تایبەت سوننەکان لە ئازادییەکی ئەوتۆ بەهرەمەندبن و لەلایەکی تریشەوە ڕازی بە دانی حەق و حوقووقی کەمایەتییە نەتەوەییەکان نەبوو، ئەیەویست ئەم دوولایەنە بەگژ یەکتردا بکات و بە تیرێك دوونیشان بپێکێت. بەپێی ئەو خالّە هاوبەشانەی کە لەگەل لایەنی مەزهەبیدا بوویان و بەدانی قەول و وادەی نادروست و ڕێکەوتنی کاتی، پێڕەوانی بونیادگەرای سوننەی لە ناوچەکانی کوردستان و بەلووچستان گەیاندە ئەو قەناعەتەی کە بۆ بەشداربوون لە دەسەلاّتی ولاّت و ئیدارەکردنی ناوچەکانی خۆیان دیفاع لە مان و مەوجوودییەتی ئیسلام و (ئینقلاب) بکەن.

لەسەر ئەو قەول و بەلّێن و ڕێکەوتنانە و بەپێی ئەو ئیستراتژییە هاوبەشەی کە بوویان فێندەمێتالی شیعەی تازە بەدەسەلاّت گەیشتوو و بونیادگەرای سوننەی تینووی دەسەلاّت کەوتنە دژایەتیکردنی هێزە شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازەکان و بە بەرنامەیەکی هاوبەش و لەیەك جەبهەدا، لە بەرابەر بەرەی نوێخواز و عەلمانییدا یەکیانگرتەوە.

تاقم و گروپە ئیسلامییەکانی کورد و بەلووچ کە بەهۆی بێ ئەزموونی و ناشارەزایی کەوتبوونە داوی پیلان و بەرنامەکانی ڕژێمی ئیسلامی و خەویان بە دەسەڵاتی وادە پێدراوەوە دەبینی، دەستیان دایە دژایەتیکردنی حیزب و لایەنە سیاسیەکانی سەر بەم دوونەتەوە هەوڵیاندا لاوازیان بکەن.

یەکێك لەو گروپانەی کە کەوتە خزمەت مەرام و ویستەکانی ڕژێمی ئیسلامی و دژایەتی هێزە شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەرەکانی کوردی کرد، «مەکتەبی قورئان» بوو بە ڕێبەری عەلامە ئەحمەدی موفتی زادە. ئەم گروپە کە خۆی بە نوێنەری توێژی فەندەمێنتالی سوننە لە کوردستان دەزانی، لە سەروبەندی شۆڕشدا سەری هەڵدابوو و بە پشتیوانی پێڕەوانی ئیخوان ئەلموسلمین هەڵسووڕانی ئاشکرای خۆی دەستپێکردبوو.

## مەکتەبی قورئان، یەکەم گروپی فەندەمێنتالیزمی سوننە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

دروستبوونی مەکتەبی قورئان ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی پێش شۆڕشی جەماوەری ئێران و یەکەم هەوڵەکانی ئەحمەدی موفتی زادە بۆ پێکەوەنانی ئەم تاقمە لە نیوەی دووهەمی حەفتاکانەوە دەستی پێکرد. موفتی زادە کە پێشتر و بە ماوەی چەند ساڵ سەرگەرمی خەباتی میللی و نەتەوەیی بوو، دوای ئەوەی کە لە خەوبینینێکی مێژوویی‌دا ڕێگای ڕاستەقینەی خۆی دۆزییەوە دەستی دایە تەبلیغکردنی بیری فێندەمێتالیزمی سوننە و هەولی پێکهێنانی گرووپێکی‌ئیسلامی دا. پاش چەند ساڵ تەبلیغی بەردەوام و چڕوپڕ و پێوەندیگرتن لەگەل خەڵك و تەلەبە و مامۆستایانی ئایینی، چەندین کەس لە ناوچە جۆرا و جۆرەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون بە پێڕەو و لایەنگری ڕێبازی فێندەمێتالیزمی ئیسلامی و لەگەل ئەحمەدی موفتی زادەدا بەیعەتیان کرد. هەرچەند موفتی زادە و پێڕەوەکانی لە زۆربەی شار و ناوچە سوننەنشینەکانی

کوردستاندا لە حاڵی فەعالییەت و هەڵسووڕانی تەبلیغیدا بوون بەلام شاری «سنە» وەك شوێنێکی گەورە و پڕجەماوەر بوو بە بنکەی سەرەکی موفتییەکان و ئەندامانی پلەبەرزی (مەکتەب) لەوێ نیشتەجێ کران. بە نیزیکبوونەوە لە رووخانی دەسەلاتی پەهلەوی، پێڕەوان ولایەنگرانی موفتی زادە زیاتر ئەکەوتنە خۆیان و بۆ هەلومەرجی دوای شۆڕش ئامادە دەبوون، ئەوان لەو سەردەمەدا زۆرتر هەوڵی ڕەخنەکردنی نێو خەڵکیان دەدا و بەدوای بەهێزکردنی پێگە و نفووزی جەماوەری خۆیانەوە بوون. لە نەتیجەی ئەو هەولانەدا و لەچەندین ناوچەی رۆژهەلاتی کوردستان، خەڵکانێکی زۆرتر لایەنگریی خۆیان لە ئەحمەدی موفتی زادە دەربڕی و هەموو ئەو کەسانەی کە بەجۆرێك کەوتبوونە ژێرکاریگەری بیری فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی، پشتیوانی ناوبراویان کرد. شار و ناوچەکانی: پاوە، جوانرۆ، کامیاران، سنە،مەریوان،سەقز، بۆکان و.... زیاتر لە شوێنەکانی تر بوون بە جێی هەڵسووڕانی لایەنگرانی موفتی زادە و زۆرترین بانگەشە و بانگەوازیان بۆ ئیسلامی سیاسی و فەندەمێنتال تیاداکرا.

ساڵی١٣٥٦ی هەتاوی «١٩٧٨ ز» و لەحاڵێکدا کە تەمەنی رژیمی پاشایەتی بەرە و کۆتایی و ئاوابوون دەڕۆیشت، ئەحمەدی موفتی زادە دروستبوونی «مەکتەبی قورئانی» ڕاگەیاند و بەم ڕاگەیاندنەش یەکەم گروپی بونیادگەرای ئیسلامی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان لە دایك بوو.ماوەیەك دواتر و یەکەم ناوەندی تەبلیغی و ڕاهێنانی سەربەم گروپە بەناوی «مەدرەسەیقورئان» لە شاری مەریوان و پاشان لە سنە و چەند شاری تریش دامەزرا و بووبە جێگەی تەبلیغی بیری فێدەمێنتالیزمی ئیسلامی و خولی ڕاهێنانی قورئان و ئەخلاقی ئیسلامی تیاداکرایەوە. بە نیزیك بوونەوە لە سەرکەوتنی ئێجگارەکی و ڕۆیشتن بەرەو پێچانەوەی تاج و تەختی پاشایەتی، پێڕەوان و لایەنگرانی موفتی زادەش تێکەڵ بە حەرەکەتە ئیعترازییەکان بوون و لە نێو ڕیزی خەڵکی ناڕازی وئازادیخوازەوە

دەنگ و درووشمی ئیسلامخوازییان هەڵبڕی. هێنانی«عەدالەتی عومەر و ئازایەتی عەلی» یەکێك لەو درووشمانە بوو کە لەلایەن مەکتەبییەکانەوە و بەمەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك بەرزکرابووەوە.

لەو بۆشاییە سیاسیەدا کە دوای ڕووخانی ڕژێمی پەهلەوی وڵاتی ئێرانی داگرتبوو، زۆربەی شار و ناوچەکانی کوردستان لەلایەن شورای ئینقلابەوە (شۆڕش) ئیدارە دەکرا، ئەم شورایە پێکهاتبوو لە نوێنەری حیزب و لایەنە سیاسیەکان و ئەرکی سەرپەرشتی و ڕاپەراندنی کاروباری کۆمەڵگای کوردستانی لە سەرشان بوو. ئەحمەدی موفتی زادە و چەندکەس لە ئاوەڵەکانی، وەك بەشێك لەئەندامانی شورای یازدەکەسی شاری سنە هەوڵی دابەزاندنی بەرنامە و پرۆگرامەکانی خۆیانیان دەدا و ئەیانویست ئەم شورایە بخەنە خزمەت مەرام و ئامانجەکانیان، جیا لە شاری سنە، پێڕوانی مەکتەبی قورئان لە ناوچەکانی تری کوردستانیش هەوڵیاندا ببنە ئەندام و بەڕێوەبەری شورای ئینقلاب بەڵام بەهۆی لاوازی پێگە و نفووزی جەماوەری نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەستبێنن.

دوای خۆسەپاندنی ڕژێمی ئیسلامی و لەحاڵێکدا کە گەلی‌کورد لە ڕۆژهەڵاتی‌کوردستان بەتەمای گەیشتن بە مافەڕەواکانی بوو و بۆ پێکهێنانی ناوچەیەکی خودموختار لەو بەشەی کوردستان هەوڵی دەدا، مەکتەبی قورئان وەك گروپێکی ئیسلامی و فێندەمێنتال دەستی دایە تەبلیغ بۆ بەرنامە و مەرامە ئایینیەکانی خۆی و فکری خودموختاری ئیسلامی هێنایە ئاراوە، ئەمە لەحاڵێکدا بووکە ئەم بەرنامە و بۆچوونانە لەگەڵ داب ونەریتەکانی کۆمەڵگای کوردەواری و سیاسەتی حیزبە کوردییەکاندا نەدەگونجا و لەنێو خەڵکی کوردیشدا کڕیاری نەبوو. سوور بوونی مەکتەبی قورئان لەمەڕ بەرنامەکانی و پێداگرتنی لەسەر زاڵکردنی یاسا و ڕێسای فێندەمێنتالی ئیسلامیی لە کوردستان، وایانکرد کە خەڵك و لایەنەسیاسیەکان لە بەرابەر ئەو تاقمەدا ڕابوەستن و پێش بەجێبەجێکردنی پیلانەکانی بگرن. ئەحمەدی موفتی زادە کە خۆی وگروپەکەی،

بە نوێنەری ڕاستەقینەی گەلی کورد دەزانـی و لـە فکـری دەمـەزەرد کردنـەوەی ڕێبازی ئیسلامدا بوو، بەبێ بایەخدان بەئیرادەی جەماوەر مافی نوێنەرایەتیکردنی گـەلیکـوردی بەخۆیـدا و کەوتـە دژایـەتیکردنی ئـەوهێزە نیـشتمانپەروەر و ئازادیخوازانەی کە نوێنەری ڕاستەقینەی ئەوگەلە بوون.

بەمەبەستی گەیشتن بە مەرام و ویستەکانیان و بەپێی ئەوخاڵە هاوبەشانەی کە لە گەل ڕژێمی ئیسلامیدا بوویان، پێڕەوانی مەکتەبی قورئان پاڵیان بەم ڕژێمـەوەدا و بوون بە بەڕێوەبەر و جێبەجێکەری پیلان و بەرنامەکانی لەکوردستـاندا. دوای چەندین دانیشتنی لەگەل بەرپرسانی پلەیەکی ڕژێم و شەخسی ئایەتوڵاخومەینی، ئەحمەدی موفتی زادە ڕەزامەندی ئـەوانی بـۆ دامەزرانـدنی خودموختارییـەکی ئیـسلامی لـە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان وەرگـرت و تەنانـەت حـوکمی خودموختارییەکەی لە گیرفانی نا. لە ڕاستیدا ئەم ڕەزامەندی و ڕێکەوتنە درۆیین و تاکتیکی بوو و نییەتی بەڕێوەبەرانی ڕژێـم لێـی فریـودانی تـاقمی مەکتـەبی قورئان و هاندانی بوو بۆ بەگژاچـوونەوەی هێـزە سیاسـی و نیـشتمانپەروەرەکانی کورد، ئەحمەدی موفتی زادە لـەو پـەڕی خۆشـباوڕیدا کەوتـە خزمـەت پـیلان و بەرنامەکانی ڕژێمی ئیسلامی و بەبێ ئەوەی لە نییەتی ئەوان ئاگاداربێت دەستی دایە جێبەجێکردنی ئەو قەول و وادانەی کە پێی دابوون.

لایـەنگرانی فێنـدەمێنتالی ئیـسلامی و پێڕەوانـی مەکتـەبی قورئـان، لـەژێر کاریگەری ڕێکەوتنەکەی موفتی زادە لەگەل ڕێبەرانی ڕژێمدا و بە پـشت بەسـتن بەو متمانەیەی کـە ڕێبەرەکـەیان پێـی بەخـشیبوون، گەیـشتبوونە ئـەو بـاوڕ و قەناعەتەی کە دەتـوانن لـە کوردسـتان و بـە پـشتیوانی حکومـەتی ناوەنـدی دەسەڵاتێکی خودموختار لە سەر ئەساسی مەزهەبی سوننە بونیادبنێن، بۆیە زۆر زوو کەوتنە تەبلیغ دژی ئازایخوازان و هەوڵی بەدناو کردنی حیـزب و لایەنـەکانی ناو گۆڕەپانی سیاسی کوردستانیاندا. لەم پێنـاوەدا و بۆگەیـشتن بـەو مەبەسـتە،

ناوەنــدەکانی «مەدرەســەی قورئــان» بــوون بەمینبــەری ســەرەکی ڕێکخــستن وتەبلیغات و ویستیان لە یەکەم هەنگاودا هەستیئایینی ومەزهــەبی خــەڵك لــە بەرابەر هێزە شۆڕشگێڕ و عەلمانییەکاندا بوروژێنن.

پەرەسەندنی شەڕی تەبلیغی و بەردەوامبوونی مەکتەبی قورئان لە ئـاژاوەگێڕی وچەواشەکاری، زەمینەی بۆ تێکهەڵچوون و شەڕی چەکدارانە فەراهەم کـرد و لــە یەکەم دژکردەوەی جەماوەر و هێزە سیاسیەکاندا، ناوەندەکانی مەکتەبی قورئــان لە هەموو شار و ناوچەکانی کوردستان کەوتنە بەر پــەلامار و بەتــەواوی تێــك و پێکنران. هێزی چەکداری مەکتەبی قورئان کــە شــان بەشــانی جاشــەکانی ســەر بەرژیم و بەناوی پێشمەرگەی موسوڵمانەوە سەنگەر و سێرەیان لــە خــەڵکیکـورد گرتبوو نەیانتوانی بەر بە هێرش وپەلاماری جەماوەری بگرن .

ســـەرئەنجام نــۆ مـــانگ دوای شـــۆڕش و لـــەمانگی خـــەزەڵوەری ١٣٥٨ی.ە (١٩٧٩م)دا، پاش هەرەس هێنان و دارمانی تەواوەتی، تاقمی مەکتەبی قورئــان بەرە و شاری کرماشان کــە لــە ژێــر کــۆنترۆڵی ڕژێمـدابوو «هیجرەتیــان» کـرد و ژمارەیەکیشیان ڕێگای شارەکانی تاران، ئیسفەهان، هەمەدان و...یان گرتەبــەر. بەگەیشتنیان بۆ کرماشان، موفتی زادە و پێرەوەکانی بەپێــچەوانەی ئــەوەی کــە چاوەڕوانی بوون لەگەل کەم لوتفی و سڕ و ساردی کاربەدەستانی ڕژێمی ئیـسلامی بەرە و ڕووبوون. ئــەوان کــە بــەهۆی خزمــەتکردنی ئــەو ڕژیمــەوە لــە کوردســتان دەرکرابوون و تووشی زەرەر و زیانی گەورە هــاتبوون دەســتیان دایــە مــانگرتن و دەنگیناڕەزایەتیان لە بەرابەر بەرپرسانی دەسەڵاتدا بەرزکردەوە. ئەم مــانگرتن و ناڕەزایەتی دەربڕینە نەك نەبووە هۆی گۆڕانی هەڵوێستی بەرپرسانی رژێم، بــەڵکو بووبە ســەرەتای ســەرکوت و تواندنــەوەی گروپــی مەکتــەبی قورئــان و بەمــەش ئاشکرابوو کە هەموو ڕێکەوتنەکانی ڕێبــەرانی ڕژێــم لەگــەل ئەحمــەدی مــوفتی زادەدا شانۆیی و درۆیین وتەنیا بۆ هانــدانی نــاوبراو و گروپەکــەی بــووە لــەدژی

خەڵك و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان. کاتێك کە مەکتەبی قورئان نەیتوانی ویست ومەرامەکانی ڕژێمی ئیسلامی لە کوردستان جێبەجێ بکات و ببێتە دژەهێزێکی لێهاتوو لە بەرابەر هێزە شۆڕشگێڕ و نەتەوەخوازەکاندا، ڕژێمی ئیسلامی ڕواڵەتی ڕاستەقینەی خۆی لێ ئاشکرا کرد وهەموو ڕێکەوتنەکانی لە گەڵ ئەو گروپەدا لە بیر بردەوە. پاش ماوەیەك مانەوە لە ماڵی خزم ودۆستان، سەرئەنجام ڕێبەری مەکتەبی قورئان خانوویەکی لە نیزیك مەیدانی شارەداری کرماشان ئیجارەکرد و لە گەڵ چەندکەس لە نیزیکانی لێی جێگیربوون. لە ماوەی نیزیك بە سێ ساڵ مانەوەی لەو شارە، موفتی زادە میوانداری زۆرکەسایەتی ئایینی و سیاسی (ئێرانی و دەرەکی) کرد و کەم لوتفی و بێ وەفایی ڕژێمی ئیسلامی بۆباسکردن. ئەو کە دوای تەجروبەی تاڵ و شکست خواردووی کوردستان و ئاگاداربوون پیلان و بەرنامەکانی حکومەتی ئیسلامی، تووشی قەیرانێکی فکری و دەروونی هاتبوو، ئەیەویست بەجۆرێك لە و قەیرانە ڕزگاری بێت و قورسایی ئەو شکست و ناکامییە لەسەر خۆی لاببات.

موفتی زادە لەو هەلومەرجەدا، هەوڵی دروستکردنی جەبهەیەکی یەکگرتووی سوننەی لە ئاستی ئێراندا دەدا و بەومەبەستەش پێوەندی بە گروپ و لایەنە سوننەکانەوە کردبوو. پاش چەندین چاوپێکەوتن و ڕاگۆڕینەوە، سەرئەنجام لە کۆبوونەوەیەکی ڕێبەران و کەسایەتییە سوننەکانی ئێرانی لە تاران (ڕۆژەکانی ١٢ و١٣ی خاکەلێوەی ١٣٦٠ی-١٩٨١م) دوای شەو و ڕۆژێك قسەو باسی چڕوپڕ و ڕاوێژکردن، بڕیاردرا بە دروستبوونی شورای ناوەندی ئەهلی سوننەی ئێران (شمس) و یازدەکەس لە عولەما و ڕێبەرانیمەزهەبیی سەر بە هەموو ناوچە سوننەنشینەکانی وڵات، وەك لیژنەی ڕێبەریی ئەم شۆرایە دیاریکران و ئەرکی بەدوادا چوون و دەستەبەرکردنی ماف و خواستەکانی پێڕەوانی مەزهەبی سوننەیان پێسپێردرا. ساڵێك دواتر و لە ڕۆژانی١٤و١٥ی گەلاوێژی ١٣٦١ ی هەتاویدا (١٩٨٢م)، کۆبوونەوەیەکی هاوشێوەی کۆبوونەوەکەی تاران لە کرماشان

و له ماڵی ئەحمەدی موفتی زادە بەڕێوە چوو، کۆمەڵێك لە عولەما و ڕێبەرانی سوننە و ئەندامانی شۆرای (شمس) بەشداری کۆبوونەوەکە بوون و لە ساڵڕۆژی دامەزرانی شورادا چەند وتار و بابەتیان خوێندەوە. بەشداربووانی کۆبوونەوەکە، ڕەخنەیان لە و سیاسەتانە گرت کە ڕژێمی ئیسلامی دەرهەق بە پێڕەوانی مەزهەبی‌سوننە پەیڕەوی دەکرد و لە بڕیارنامەی کۆتایی کۆبوونەوەکەیشدا وێڕای گونجاندنی ئەو ڕەخنانە، داوا لە دەسەڵاتی ناوەندی کرابوو کە گوێ لە ویست و داخوازییەکانی ئەهلی سوونەی ئێران بگرێت و سیاسەتی سەرکوت و پێ ڕانەگەیشتنیان لەسەر هەڵگرێت.

هەر ئەو ڕۆژە و لە حاڵێکدا کە دووکەس لە ئەندامانی مەکتەبی قورئان لە حاڵی بڵاوکردنەوەی بڕیارنامەکەدا و لە لایەن ئەفرادی سەر بە ڕژێمەوە گیران و ڕاپێچی زیندانکران. گیرانی ئەم دووکەسە سەرەتا و دەسپێکی شەپۆلێکی بەربڵاوی گرتن و ڕاوەدوونانی ئەو گروپ و تاقمە ئیسلامییانە بوو کە نوێنەرایەتی بونیادگەرای ئیسلامی سوننەیان لە ناوچە سوننە نشینەکانی ئێراندا دەکرد.

لە ماوەی دووهەفتەدا، دەیان کەس لە ئەندامان و لایەنگرانی مەکتەبی قورئان لە شار و ناوچەکانی‌تری کوردستان گیران و ڕۆژی ٨ی خەرمانانی (١٣٦١ه-١٩٨٢م) یش، ئەحمەدی موفتی زادە و یەکێك لە نیزیکانی بە ناوی ئەمینی‌نەکبەری لە شاری تاران گیران و زیندانی کران. ئەم ڕەوتی گرتن و زیندانیکردنە بووە هۆی بەرز بوونەوەی دەنگی ناڕەزایەتی پێڕەوانی بونیادگەری سوننە، بەڵام ئەم ناڕەزایەتی دەربڕینەش نەبووە هۆی پاشگەز بوونەوەی ڕژێمی ئیسلامی لە گرتنە بەری سیاسەتی سەرکوت و تواندنەوە و ئەو ڕژێمە بەردەوامبوو لە گرتن و ڕاوەدوونانی ئەندامان و لایەنگرانی گروپ و لایەنە ئیسلامییە سوننەکان. کۆتاییەکانی بەهاری (١٣٦٢ ه-١٩٨٣م )، لە پەلامارێکی کوتوپڕ و بەربڵاودا و لە چەندین شار و ناوچەی کوردستان، نیزیك بە

دووسەد کەس لە لایەنگرانی موفتی زادە دەزگیرکران و دوای لێکۆڵینەوە بە دوو تا پازدە ساڵ زیندان حوکمدران. (زۆربەی ئەو کەسانە پێش تەواو کردنی حوکمەکەیان و لە خەزەڵوەری ١٣٦٤هـ- ١٩٨٥م دا ئازادکران.)

ئەحمەدی موفتی زادە کە بە پێنج ساڵ زیندان مەحکوم کرابوو، دوای تەواوبوونی حوکمەکەی بۆ ماوەی پێنج ساڵی‌تر لە زیندان ڕاگیرا و سەرەنجام پاش دەساڵ و لە ڕێکەوتی ١٣٧١/٥/١٣ ی هەتاویدا (١٩٩٢م) ئازادکرا. هەرچەند بە ئازادبوونی ناوبراو خۆشی و شادی کەوتە نێو پێڕەوان و لایەنگرانی بەڵام ئەم خۆشییە کاتی و کەمخایەن بوو. ئەو لە ماوەی دەساڵی مانەوەیدا لە زیندان، تووشی نەخۆشی ڕۆحی و جەستەیی هاتبوو و نەك نەیدەتوانی جارێکی تر ڕێبەریی تاقمەکەی بکات بەڵکو بەهۆی کاریگەری و کوشەندەیی نەخۆشییەکەی تا لێواری مەرگ ڕۆیشتبوو و گوڕ و تینی مانەوەی تیا نەمابوو. بۆیە پاش ماوەیەك و بەمەبەستی چارەسەرکردن، برایە نەخۆشخانەی ئاریای تاران و کەوتە ژێر چاودێری پزیشکان بەڵام سەرەڕای هەوڵێکی زۆر، مەرگ مۆڵەتی مانەوەی زیاتری پێنەدا و ڕۆژی ١٣٧١/١١/٢٠ (١٩٩٣) و پێنج مانگ دوای هاتنە دەرەوەی لە زیندان، کۆچی دوایی کرد.

لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە موفتی زادە لە زینداندا بوو، پێڕەوان و لایەنگرانی بە شێوەی نهێنی و شاراوە کاریان دەکرد و هەولی بەهێز کردن و بووژانەوەی تەنزیماتی خۆیان دەدا، شۆرای بەڕێوەبەر بەپێی ئەو ڕێنوێنیانەی کە لە ڕێبەری زیندانی کراوەوە بۆی دەهات کاروباری مەکتەبی ئەبردەپێش و سەرپەرشتی جموجۆڵی نهێنی هەڵسووڕاوانی تەنزیماتیی دەکرد. ئەو ئاڵ و گۆڕانەی کە لەپشتی میلەکانی زیندانەوە بەسەر موفتی زادەدا هاتبوو و کاریگەرییان لەسەر بیر و بۆچوون و ئەندیشەکانی ئەو دانابوو، گۆڕانی سیاسەت و بەرنامەکانی مەکتەبی قورئانی بەدواوە بوو و شێوازێکی نوێی کارکردنی لێکەوتەوە. لە گەڵ ئەوەدا کە مەکتەبیەکان هەوڵیان دەدا بۆ جارێکی تر لە نێوخەڵکی‌کوردستاندا

پێگە و جێگەیەك پەیدا بكەن و بە سیما وسیاسەتێكی نوێوە تەبلیغ بۆ بیری فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی بكەن بەڵام نەیانتوانی بەوجۆرەی كە پێویستە بەرەوپێش برۆن و ئەمەش چەندهۆكاری لە پشتبوو كە بریتیبوون لە:

**یەكەم :** ڕق و بێزاری خەڵكی‌كورد لە مەكتەبی قورئان بە هۆی ئەوخیانەتانەی كە ساڵانی دوای شۆڕش دەرهەق بەم گەلە ئەنجامی دابوو.

**دووهەم :** سەرهەڵدانی ناكۆكی نێوخۆیی لە نێو ڕیزەكانی مەكتەبدا.

**سێهەم :** دڵساردی و نائومێدی ژمارەیەك لە ئەندامان بە هۆی گۆڕانی سیاسەت و بەرنامەكانی ئەم گرووپەوە.

**چوارەم :** ترسی كەسانێك لە گیران و زیندانی كران یا ترس لەدەركران و وەرنەگیران لە ئیدارە و ناوەندە دەوڵەتییەكان.

**پێنجەم :** جیابوونەوەی پێڕەوانی ئیخوان ئەلموسلمین لە مەكتەبی قورئان و دروستكردنی تەنزیماتێكی نوێ وسەربەخۆ (ژمارەیەكی زۆر لە ئەندامان و لایەنگرانی مەكتەبی قورئان چووبوونە لای ئەم تەنزیماتە )

دوای مردنی موفتی زادە و لەحاڵێكدا كە مەكتەبی قورئان قۆناغێكی نوێی كاری ڕێكخستن و تەنزیماتیی دەستپێكردبوو و بە بەرنامە و پرۆگرامی تازەوە هەوڵی ڕاپەڕاندنی كارەكانی دەدا، ناكۆكی و دووبەرەكی لە نێو ڕێبەرایەتی ئەم گروپەدا سەری هەڵدا و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە تەنزیمات بەرە و لاوازی و نەویبوونی زیاتر بڕوات. بەردەوامبوون و پەرەسەندنی ناكۆكییەكان، لە ساڵی ١٣٧٥ی.ه ١٩٩٧م.دا، جیابوونەوەی جەماعەتێكی بە ڕێبەری حەسەنی ئەمینی لێكەوتەوە، ئەمینی و دار ودەستەكەی دوای دابڕان لە تەنزیماتی گشتی، وەك مەجموعەیەكی نوێ و بەناوی مەكتەبی قورئانی كوردستانەوە، جیابوونەوە و دەستبەكاربوونی خۆیان ڕاگەیاند. ئەم كەسانە لە گەڵ ئەوەدا كەخۆیان بە پێڕەوی

ڕاستەقینەی ئەحمەدی موفتی زادە و درێژەدەری ڕێگە و ڕێبازی ناوبراو دەزانی زۆر زوو کەوتنە ژێرکاریگەری ئاڵ و گۆڕە نوێیەکانی دنیای ئیسلام و بیر و هزری بونیادگەرایانەی خۆیان توند و تۆڵتر کرد. گرتنەبەری ئەم ڕێبازە توندڕەوانەیە و کەڵك وەرگرتن لە ناوی مەکتەبی قورئان، لەماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا جۆرێك شەڕی تەبلیغی لەنێوان قۆڵەکەی مەلاحەسەن و شورای مودیریەتی مەکتەبی قورئاندا دروستکردووە و هەردوولا بەدەرکردنی ڕاگەیەندراو و ڕوونکردنەوە ویستوویانە یەکتری بەلادان لە ڕێگە و ڕێبازی «کاك‌ئەحمەد» تاوانبار بکەن. ئەم شەڕە تەبلیغییە تا ئیستاش هەر بەردەوامە و هەوڵی نێوبژیوانانیش نەیتوانیوە پێشی پێ بگرێت.

شورای مودیرییەتی مەکتەبی قورئان تا ئیستا چەندین جار داوای لە حەسەنی ئەمینی کردووە کە یا بگەڕێتەوە سەر ڕێبازی موفتی زادە یا چیتر بەناوی مەکتەبی قورئانەوە و وەك حاکمی شەرعی کوردستان خۆی نەناسێنێت و چەواشەکاری نەکات. لەم دواییانەدا و پاش چەندین موقابەلە و وتوووێژی حەسەنی ئەمینی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا و خۆناساندنی وەك بەرپرسێکی مەکتەبی قورئان و حاکمی شەرعی کوردستان، شۆرای مودیرییەت بە دەرکردنی ڕاگەیەندراوێك بە توندی هێرشی کردۆتە سەر مەلاحەسەن و ئاگاداری کردۆتەوە کە هەقی نییە لەملاولا و وەك نوێنەری مەکتەبی قورئان خۆی بناسێنێت و قسە بکات. لەم ڕاگەیەندراوەدا هاتووەکە:

مەلاحەسەنی ئەمینی بەئاشکرا دژایەتی ئەو بنەما مەعریفی و ئیسلامییە دەکات کە لەلایەن «کاك ئەحمەد» ەوە و لەسەر ئەساسی شارەزایی ورد و دەقیق لە ئایینی ئیسلام دانراوە. حەسەنی‌ئەمینی چەند ساڵێکە ڕیزی مەکتەبی قورئانی بەجێ هێشتووە و سەرگەرمی کار و ژیانی ڕۆژانەی خۆیەتی. پێشتریش لە بەیانییەیەکی هەمان شۆرادا کە ١١ی ئازەری١٣٨١ ی هەتاویی دەرچووە

جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە:(حەسەنیئەمینی نە مەکتەبی قورئانییە نە حاکمی شەرعی کوردستانە). لە وڵامی ئەو ئیدیعایەی مەلاحەسەنیشدا کەخۆی بەحاکمی شەرعیکوردستان دەزانێ و ئیدیعا دەکات کە لە لایەن موفتی زادەوە ئەم پۆستەی پێ بەخشراوە، ڕاگەیەندراوەکەی شۆرای مودیرییەت ئاوا ئەڵێت: دوای ئەوداواکارییەی کە کاتی خۆی لە «کاك ئەحمەد» کرا بۆ ناساندنی کەسێك وەك ڕاپەڕێنەری کار و باری مەحکەمەی شەرع لە کوردستان، لە وڵامنامەی ڕێکەوتی ١٣٥٩/١١/٤ھ (١٩٨١) دا، حەسەنی ئەمینی بۆ ئەم پۆستە پێشنیار دەکرێت بەڵام لە کۆتایی ساڵانی زینداندا و دوای ئاگاداربوونی لە وەزعییەتی مەکتەب، «کاك ئەحمەد» مەجمەع و شۆرای هەڵبژێردراوی هەڵوەشاندەوە و لە نامەکانی ژمارە دوو و سێی ١٣٦٩ھ. ١٩٩٠دا، مەلاحەسەن وەك بەرپرسی بەشی «زواج و تەڵاق و شتی تری لەوبابەتە» لە هەیئەتی «قضاء و افتاء» دیاریکرا کە دوای فەوتی «کاك ئەحمەد» ئەو پۆستەیشی لە دەستدا. (حەسەنی ئەمینی پێشتر و لە ساڵی ١٣٥٦ی هەتاویدا کە ئەحمەدی موفتی زادە حاکمی شەرعی کوردستان بوو، وەك سکرتێر و بەرپرسی دەفتەری ناوبراو کاری دەکرد.)

هەرچەند تاقمەکەی حەسەنی ئەمینی خۆی بەخاوەن ڕێبەرییەکی شۆرایی ئەزانێت و چەند کەسێکی وەك شۆرای ڕێبەری دیاری کردووە بەڵام لە ئەساسدا ئەم شۆرایە پێڕەوی لە شەخسی مەلاحەسەن دەکات و هەموو شتێك لەسەر بڕیار و فتوای ناوبراو بەڕێوە دەچێت. ئەمە یەکێکی ترە لەو خاڵانەی کە لەگەل ئەو بەرنامەیەدا کە ئەحمەدی موفتی زادە بۆ داهاتووی مەکتەبی داناوە جیاوازی هەیە و زۆرجاریش ڕێبەرایەتی باڵەکەیتری مەکتەبی قورئان« شورای مودیرییەت»، ئیشارە بەو خاڵە دەدەن و بە ناتەبای دەزانن لەگەل سروشتی مەکتەبی قورئان و خوو و ڕەوشتی « کاك ئەحمەد» دا. بە پێی ئەو بەرنامەیەی

که لە لایەن ڕێبەری کۆچ کردووی مەکتەبی قورئانەوە دانراوە، شکڵی ئیجرایی و ساختمانی تەنزیماتیی مەکتەب بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری کراوە:

**الف** . « شۆراي موديريەت »: بۆ سەرپەرشتی و ڕێبەریکردنی کار و باری مەکتەب.

**ب** . هیئەی « افتاء و قضاء »: بۆ ئیدارەکردنی مەحکەمەی شەرعی کوردستان بەشێوەی گروپی و لەژێر چاودێری شۆرای مودیرییەتدا.

مەکتەبی قورئان بە مەبەستی «احياء الدين»، تازە کردنەوە و زیندو کردنەوەی دینی خوداوەند دامەزراوە و هەوڵ بۆ دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام دەدات، موفتی زادە لەو باوڕەدا بوو کە لەدوای خەلافەتیخولەفای ڕاشدینەوە و نەمانی شۆرای « اولي الآمر »، دینی ئیسلام بەو جۆرەی کە پێویستە پێڕەوی لێنەکراوە و شەرعییەتی خۆی وەرنەگرتووە، بۆیە پێویستە موسوڵمانان بە گەڕانەوە بۆ لای بنەماکانی ئەو دینە، داوەتبکرێن و بخرێنەوە سەر ڕێگەی ڕاست. مەکتەبی قورئان لە سەر ئەم بیرۆکەیە و بەو مەبەستە هاتە ئاراوە و تا ئیستاش هەر بەو نییەتەوە خەریکی کار و تێکۆشانە. هەروەها ئەحمەدی موفتی زادە، سێ قۆناغی بۆ «ڕێبەریی» مەکتەبی قورئان و داوەتی ئیسلامی داناوە کە بەم شێوەی خوارەوەن:

- **قۆناغی «انذار» لەسەرەتای حەرەکەتدا، کە ڕێبەریی شۆڕشگێڕ و ئینقلابی تیایدا تەنیا و غەریبە.**
- **قۆناغی« مشاورە» لەکاتی حەرەکەت و بەرەو پێشچووندا، ڕێبەر، بەپێی شارەزایی و لێهاتووییان لە بیر و بۆچوونی پێڕەوانی کەڵك وەردەگرێت و ڕایان دەهێنێت بۆ کاری شۆرایی.**

- **قۆناغی «شۆرا» دوای فەوتی ڕێبەر، لیژنەی هەڵبژێردراو سەرپەرشتی کارەکان دەکات و هەریەك لە پێڕەوان و ئەندامان بە نیسبەت سەلاحییەت و شایستگییەی کە هەیانە، هەقی ڕادەربڕین و بەشداریکردنی کارەکانیان هەیە و ملکەچی دەستووراتی شۆرایش دەبن.**

شۆرای مودیرییەتی مەکتەبی قورئان، بە پێی ئەم بەرنامەیە و لەسەر بڕیار و دەستووراتی ڕێبەرەکەی کاردەکات و ئێستا لە قۆناغی سێیەمی ڕێبەریدایە، ئیستراتژی شۆرا لەم قۆناغەدا داوەتکردنی خەڵکە بە گەڕانەوە بۆ لای ئوسولە بونیادییەکانی ئیسلام و ڕاهێنان و ئامادەکردنیانە بۆ پێکەوەنانی کۆمەڵێك ئینسانی نموونە و موسوڵمان تاکوو مرۆڤە گومڕا و لەخشتە براوەکان بگێڕنەوە بۆ لای خوداوەند و سەعادەت و خۆشبەختیان بە نەسیب بکەن. هەر پێڕەوێکی مەکتەبی قورئان بە بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنە دەروونییەکانیدا (جهاد اکبر)، هەوڵی پاککردنەوەی خۆی و گەیشتن بە مەرحەلەی (تزکیە) دەدات و بە پێی ئەو ئەرك و مەسئولییەتەی کە لەسەر شانیەتی دەستەدداتە داوەت و ڕێنمایی خەڵکانی تر. هەروەك بۆ خۆیان ئەڵێن، ئەم قۆناغە درێژ خایەنە و بۆماوەیەکی زۆر بەرەوام دەبێت , بەڵام تەنیا ئەم جۆرە کارکردنەیە کە دەتوانێت ببێتە ژێربەنای حەرەکەتێکی ڕاستەقینەی دینی و موسوڵمانان لە سەر لێشێواوی و گومڕایی ڕزگار بکات.

لەم پێناوەدا و بۆ گەیشتن بە مەرامەکانیان، پێڕەوانی مەکتەبی قورئان بەردەوام لە حاڵی هەڵسووڕاندان و بۆ بەهێز کردنی تەنزیمات و پێگەی جەماوەری خۆیان تێدەکۆشن. وەرگرتنی ئەندام، ڕاهێنان و ئاموزشی پێڕەوان و لایەنگران، کردنەوەی خولی جۆراوجۆری فێرکاری، بەستنی کۆڕ وکۆبوونەوە و...، بەشێکن لە کار و باری ڕۆژانەی ئەم گروپە. تێکەڵنەبوون لەگەڵ فەعالییەتی سیاسی و حیزبایەتی و تەنانەت نەچوونە نێو حەرەکەتە فەرهەنگی وکۆمەڵایەتییەکان، یەکێکی ترە لە بەرنامەکانی شۆرای مودیرییەتی مەکتەبی قورئان. بەپێی ئەم

بەرنامەیە هیچ ئەندامێکی شۆرا بۆی نییە بە شێوەی سەربەخۆ و بە بێ ئیزن و ئاگاداری تەنزیمات تێکەڵ بەو جۆرە کارانە بێت، لە ڕاستیدا ئەوە شۆرا و ڕێبەرایەتی تەنزیماتە کە ئەرك و مەسئولییەتی ئەندامان دیاری دەکەن و هەر ئەندام و لایەنگرێکیش ئەبێ لە چوارچێوەی ئەو بەرنامە دیاریکراوەدا ئەرکەکانی خۆی ڕاپەڕێنێت. هەرچەند زۆربەی کارەکانی تەنزیماتی سەر بە شۆرای مودیرییەت بە شێوەی نهێنی و شاراوەیە و تەنیا لە چوارچێوەی تەنزیماتدا بەڕێوە دەچن , بەڵام پێڕەوانی ڕێبازی موفتی زادە و ئەندامانی شۆرا، لەنێو خەڵکدا دیار و ناسراون و بەگشتی و لە ئاستێکی بەربڵاودا خەریکی تەبلیغاتی ئاشکران. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم گروپە بە کاری دینی و ئایینییەوە خەریکە و هەوڵی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام دەدات، بەشێکی تری کارەکانی تەرخانکردووە بۆ تیجارەت و بازرگانیکردن، ئەوان بە وەرگرتنی سەدان ملوێن تمەن لە بانکەکان و سەرمایە گوزاری لە بوارگەلی جۆراوجۆردا بوونەتە خاوەن چەندین کارخانە و شەریکەی گەورە و ڕۆژانە داهاتێکی زۆریان بە نەسیب دەبێت.

« مەکتەبی قورئان » وەك یەکەم گروپی بونیادگەرای ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە گەڵ ئەوەدا کە نەیتوانی لە سەرەتای شۆڕشدا بە ئاوات و مەرامەکانی بگات و خودموختاری ئیسلامی لەم بەشەی وڵاتی کوردانندا دابەزێنێ، بوو بە ئەزموون و تەجروبەیەکی باش بۆ پێڕەوانی فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی و زەمینەی لەباری بۆ درووستبوون و سەرهەڵدانی گرووپگەلی توندڕەوی ئیسلامیی لەم ناوچەیەدا فەراهەم کرد.

## دروستبوونی

### یەکەم تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمین لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

لە بەشەکانی پێشوتری ئەم کتێبەدا چۆنێتی کاریگەری ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانیمان لە سەر سوننەکانی ئێران باسکردووە و مێژووی دەستپێکرانی جموجوولی پیڕەوانی بونیادگەری ئیسلامیمان لە ناوچەکانی کوردستان و بەلووچستان خستۆتەڕوو. لێرەدا بەوردی و بەشێوەیەکی تایبەتتر دروستبوونی یەکەم تەنزیماتی ئیخوان ئەلموسلمین لە ڕۆژهەڵاتیکوردستان و شێوازی کار کردن و تێکۆشانی ئەندامان و لایەنگرانیان ئەخەینە بەر باس. هەر وەك پێشتر باسمان کرد، ڕەخنەکردنی بیری بونیادگەری ئیسلامی لەنێو پیڕەوانی مەزهەبی سوننەی ئێرانیدا ئەگەڕێتەوە بۆ دوای دامەزرانی ڕێکخراوی ئیخوان ئەلموسلمینی میسر و بۆ ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینی جەماوەری (١٩٧٩ ی.م) گەلانی ئێران، لە ماوەی ساڵانی بەر لە شۆڕشدا و بە هۆی تەبلیغی نهێنی لایەنگرانی ڕێبازی ئیخوان ئەلموسلمین، ژمارەیەك خەڵکی سوننەی ئەم بەشەی کوردستان لەگەڵ بیری بونیادگەرای ئیسلامیدا بەیعەتیان کرد و بوون بە لایەنگر و پیڕەوی ئیخوان ئەلوسلمین.

دوای ڕاپەڕین و دەستپێکردنی هەڵسووڕانی ئاشکرای مەکتەبی قورئان، ئیخوانییەکان چوونە پاڵ ئەم تاقمە و بوون بە پشتیوان و یاریدەری برا دینیەکانیان. ئەوان کە تا ئەو کاتە نەبووبوونە خاوەن تەنزیماتێکی سازماندراو و ڕێك و پێك، لە سەر ئەو خاڵە هاوبەشانەی کە لەگەڵ ئەحمەدی موفتی زادە و مەکتەبی قورئاندا بوویان لە گەڵیان ڕێکەوتن و لەیەك سەنگەردا و بۆ دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان تێکوشانیان دەستپێکرد، ئەم هاوسەنگەری و هاوکاریکردنە بۆ ماوەی چەند ساڵ درێژەی کێشا و

بـەردەوامکرا. دوای ئـەوەی کـە مەکتـەبی قورئـان نـەیتوانی نوێنەرایـەتی فێنـدەمێتالیزمی سـوننە لـە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان بکـات و ببێـت بـە ڕێکخراوێکی بەهێز و لێهاتووی ئیسلامی، بـە تایبـەت دوای هەرەسـهێنانی لـە بەرابەر جەماوەری کورد و هێزە سیاسییەکاندا و گیران و زیندانیکرانی ڕێبـەر و ئەندامانی لەلایەن ڕژێمی ئیسلامیەوە، پێڕەوانی ئیخوان بەرەبەرە لەو تاقمە دوور کەوتنـەوە و دەسـتیان دایـە سـازدان و پێکهێنـانی ڕێکخـستنێکی تایبـەت بەخویان. ئەم تەنزیماتە بوو بە بنەمای ڕەوتێکی پێشکەوتووتری ئیسلامیسیاسی لەکوردسـتانیژێردەسـتی ئێـران و بووبـە دەسـپێکی جموجـوڵێکی نـوێی فێندەمێنتالیزمی سوننە لەم بەشـەی کوردسـتان. مـەلا ناسـری سـوبحانی کـە یەکێك بوو لە ناسـراوترین و هەڵـسووڕاوترین پێڕەوانـی ئیخـوان ئەلموسـلمین و دۆستێکی نیزیکـی ئەحمـەدی مـوفتی زادە بـوو، وەك بەرپرسـی یەکـەمی ئـەم تەنیزیماتە دیاری کرا ڕێبەریی کارەکانی بە ئەستۆوە گرت.

مەلا ناسر ماوەیەکی زۆر بوو کە بە نهێنی دەژیا و بەردەوام شـوێنی مانـەوەی خۆی دەگۆڕی، تەنزیماتەکەیـشی لـەو پـەڕی شـاراوەییدا کـاری دەکـرد و کـۆڕ و کۆبوونەوەی پێك دەهێنا. بەو حاڵەش ماوەیەکی کـەم دوای دامـەزرانی، یەکـەم تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمین کەوتـە بـەر پـەلاماری ڕژێمـی ئیـسلامی و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامان و لایەنگرانی گیران، مەلا ناسری سوبحانیش لە کاتی بەستنی کۆبوونەوەیەکدا لە شاری سنە و لەگەل چەند کەسـیتـر لـە یاریـدەرانی دەستگیر کرا و دوای ماوەیەك مانەوە لە زیندان، سەرەنجام ساڵی١٣٦٧یهەتاوی (١٩٨٨ ی.م ) لە سێدارەدرا.

بەم هێرشە و بەگیران و ئێعدامکرانی ئەندامانی پلەبەرزی، شیرازەی تەنزیماتـە ساواکەی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمین لـێکترازا و دووچـاری زەرەر و زیـانیگـەورە هـات بـە جۆرێـك کـە ئـەم تەنزیماتـە بـۆ ماوەیـەك هـەرجۆرە هەڵـسووڕان و تێکۆشانێکی هەڵپەسارد و دەستی لە کار و چالاکی هەڵگرت.

هاوکات لەگەل سەرکوت و ڕاوەدوونانی گروپ و تاقمە ئیسلامییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان بە دەستی ڕژێمی ئیسلامیئێران، لە نێو کەمپ و ئۆردووگاکانی «موعارەزەی» عێراقی لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران و کوردستاندا، کۆڕ و کۆبوونەوەی لایەنە ئیسلامیەکانی باشووریکوردستان بەردەوامبوو و ئەمەش دروستبوونی چەند حیزب و ڕێکخراوی بونیادگەرای ئیسلامی بەدواوەبوو.

(سالّی۱۹۸۲ماموّستا سەلاّحەدین محەممەد بەهائەلدین، ڕێکخراوی کۆمەلّی ئەنساری ئیسلامی دامەزراند، ئەم ڕێکخراوە ماوەیەك دواتر و لە سالّی ۱۹۸۵ کۆتایی بە تەمەنی هات و هەلّوەشایەوە. پاش ئەم تەجروبەیە، سەلاّحەدین محەممەد ئاستی پێوەندییەکانی لەگەل ڕێبەرانی ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانیدا بردە سەرەوە و لەلایەن ئەوانەوە ڕاسپێردرا بۆ دروستکردنی گروپێکی سەر بەو ڕێکخراوە لە باشووریکوردستان. سالّی ۱۹۸۷ی.م، لەسەر پێشنیاری ڕێبەرانی موعارزەی ئیسلامی کوردستانی عێراق، بڕیاری یەکگرتنی هەموو لایەنە ئیسلامییەکانی نێو ڕیزی موعارزە دەرکرا و لە ئاکامدا بە تێکەلّبوونی چەند لایەنێك بزووتنەوەیئیسلامی دامەزرا، تەنزیماتەکەی سەلاّحەدینمحەممەد و لایەنێکیتر حازر بە یەکگرتن لەگەل ئەوانیتر نەبوون و بەشدارییان لە دروستبوونی بزووتنەوەدا نەکرد. پاش ئەم ڕووداوە «مەرعانسامەڕایی» کە لەسالّی ۱۹٦۰سەرۆکی حیزبی ئیسلامی عێراقی بوو، بە نوێنەرایەتی ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانی چووە ئێران و دوای کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەل دوو لایەنە بەشدار نەبووەکەی نێو بزووتنەوەی ئیسلامی، ئەوانی لەسەر خالّە هاوبەشەکانی نێوانیان ڕێکخست و هانیدان بۆ بەهێز کردنی ڕۆحی برایەتی و یەکگرتوویی، ئەم یەکگرتووییە لە دوای ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ گەلی کورد لە باشووری کوردستان، وەك

ڕێکخراوێکی میانەڕەویی ئیسلامی دەرکەوتوو لە ژێر ناوی یەکگرتووی ئیسلامیدا هەڵسووڕانی عەلەنی و ئاشکرای خۆی دەستپێکرد.)

بەجۆرە لە سایەی دەسەڵاتێکدا کە جێگایەك بۆ هەڵسووڕانی بونیادگەرای سوننەی نێوخۆیی نەبوو، گروپ و تاقمگەلی بونیادگەرای «سووننە»ی عێراقی لەو پەڕی ئازادیدا خۆیان ڕێكدەخست و حیزب و ڕێکخراوی ئیسلامییان پێکدەهێنا. ئەو ڕژێمەی کە گەشەکردنی بونیادگەرای سوننەی لە وڵاتی ئێراندا بە مەترسییەکی گەورە بۆسەر خۆی دەزانی، بە هەموو جۆرێك یارمەتی بونیادگەرای ئیسلامی لە دەرەوەی سنوورەکانی خۆی دەدا و پشتیوانی لە گروپ و تاقمە ئیسلامییەکان دەکرد. حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی باشووری کوردستانیش وەك بەشێکی ئەم بزووتنەوەیە کەوتبوونە بەر ڕەحمەتی ڕژێمی ئیسلامی ئێران و بە هەموو شێوەیەك یارمەتی دەدران. تاقمەکەی سەڵاحەدین محەممەدی دەستەبرا و دۆستی ئیخوانەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش لەم ڕەحمەتە بێبەش نەبوو و بەناوی جیهاد لە دژی دەسەڵاتی عێراقی، لە لایەن ڕژێمی ئیسلامی ئێرانەوە یارمەتی ماڵی و مەعنەوی دەدرا.

سەرەڕای لە ئارادابوونی ئەم وەزعە و پێوەندی موعارزەی ئیسلامی عێراقی لە تەك نیزامی شیعەی ئێرانیدا، زۆربەی حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی باشووری کوردستان لەگەڵ پێڕەوانی بونیادگەرای سوننەی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دۆستایەتییەکی نیزیکیان بوو و یارمەتی یەکتریان دەدا.

جیا لە دۆستایەتی و هاوکاریکردنی نێوانیان، حوزووری ئەم حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییانە لە کوردستانی ژێر دەستی ئێران، هۆکارێك بوو بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی زیاتری بیری بۆنیادگەری ئیسلامی لەم بەشەی کوردستان و ڕەوتی ئیسلامخوازی لە نێو کوردی سوننەی ئەم پارچەیەدا بەهێزتر کرد. دوای ڕاپەڕینی مێژوویی گەلی کورد و دروستبوونی دەسەڵاتێکی کوردی و دیموکراتیك لە

باشووری‌کوردستان، ئەو حیزب و لایەنە ئیسلامییانەی کە هیچ ڕۆڵێکیان لەو ڕاپەڕینەدا نەگێڕابوو و بەشداری پرۆسەی ڕزگارکردنی کوردستانیان نەکردبوو چوونە سەر سفرەی حازری و کەوتنە تەبلیغی بەرنامەکانیان و هەوڵی بەهێزکردنی تەنزیمات و ڕێکخستنەکانی خۆیانیاندا. ئەوان کە توانیبوویان لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی ئازاد و کراوەی کوردیدا خۆیان بەهێز و ئەندام و لایەنگرێکی زۆر پەیدا بکەن، دەستیاندایە یارمەتیدانی هاوبیرەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پێوەندییەکی گەرم و گوڕتریان لەگەڵدا بەرقەرار کردن. ئەمە و چەند هۆکاری‌تر بوونە هۆی سەرهەڵدانەوەیەکی‌تری بونیادگەری سوننە لە کوردستانی ژێردەستی ئێران و ڕەوتێکی نوێی هەڵسووڕانی تاقم و گروپە ئیسلامییەکانی لێکەوتەوە. لەو سەردەمەدا بزووتنەوەی بونیادگەرای ئیسلامی لە ئاستی جیهانیدا، گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە دیبوو و جۆرێك لە هاوپەیمانی و هاوکاری لە نێوان گروپ و تاقمە ئیسلامییەکاندا هاتبووە ئاراوە. ڕێکخراوی ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانیش وەك لایەنێکی بەهێزی نێو ئەم بزووتنەوەیە گەلێك هەنگاوی بەرەو پێشی نابوو و لق و پۆپەکانی خۆی گەیاندبووە زۆر شوێنی دونیا. لە نێوخۆی ئێرانیشدا و بە گۆڕان و نەرمبوونەوەی سیاسەتی ڕژیم بە نیسبەت پێڕەوانی مەزهەبی سوننەوە، زەمینەیەکی لەبار بۆ دەستپێکردنی ڕەوتێکی نوێی داوەتی ئیسلامی ڕەخسابوو و لە ژێر کاریگەری ئەم ئاڵ وگۆڕ و پێشکەوتنانەدا، پێڕەوانی ئیخوان ئەلموسلمین لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، جارێکی‌تر خۆیان ڕێکخستەوە و دەستیاندایە بووژاندنەوەی تەشکیلات و تەنزیماتە ناکام و زیان لێکەوتووەکەیان.

شوێنکەوتووانی ڕێبازی ئیخوان ئەلموسلمین کە ماوەی چەندساڵ بوو لە هەلومەرجێکی نالەبار و پڕمەترسیدا دەژیان و بەشێوەی نهێنی و شاراوە کاریان دەکرد، ئەمجارەیان بەبێ هیچ ترس و دڵەڕاوکەیەك کەوتنە هەڵسووڕان و تێکۆشان و قۆناغێکی نوێی کاری تەبلیغی و تەنزیمیان دەستپێکرد. ئەم تەنزیماتە لە

ماوەی چەندساڵی ڕابردوودا و بە پێی بەرنامە و پرۆگرامێکی دیاریکراو کاری کردووە و هەنگاوی بەرەو پێشی ناوە. بەشێك لەو کار و چالاکییانە بریتین لە:

- **بووژاندنەوەی تەنزیمات و دابەشکردنی ئەرك و مەسئولییەتەکان**
- **پێوەندیگرتن لەگەل خەڵك و وەرگرتنی ئەندام**
- **تەبلیغاتی جۆراوجۆر و داوەتکردن لە خەڵك بە گەڕانەوە بۆ لای ئیسلامی ڕاستەقینە**
- **کردنەوەی خولی فێرکاری، قورئان و ئەخلاقی ئیسلامی و ڕاهێنانی فکری و عەقیدەتی ئەندامان و لایەنگران**
- **بەستنی کۆڕ و کۆبوونەوەی نێو خۆیی**
- **بەشداریکردنی ناڕاستەوخۆی بزاڤ و حەرەکەتە فەرهەنگی و رۆشنبیرییەکان**

بێجگە لەوانەش، تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمینی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەوڵی ئەوەی داوە کە لەگەڵ ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانیدا پێوەندی بگرێت و ئەو ڕێکخراوە لە تێکۆشان و چالاکییەکانی خۆی ئاگادار بکاتەوە. ئێستا ئەو پێوەندییە لە ئاستێکی بەرزدا بەردەوامە و ئەم تەنزیماتە بە فەرمی نوێنەرایەتی ئیخوان ئەلموسلمینی جیهانی لەم بەشەی کوردستان دەکات و بەرنامە و کار و باری خۆی لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەو ڕێکخراوەدا ڕێکدەخات. پێوەندی ئەم تەنزیماتە و یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی عێراقیش زۆر گەرم و نیزیکە بە جۆرێك کە هەردوولا لە کار و باری یەکتر ئاگادارن و پرس و ڕاوێژ لە نێوانیاندا هەیە، ئەم دوو لایەنە لە هەموو کارێکدا یارمەتی و پشتیوانی یەکتر دەکەن و ستراتژییەکی هاوبەش پێڕەو دەکەن.

شێوازی کارکردنی تەنزیماتی رۆژهەڵاتی کوردستان، هاوشێوەی بەرنامە و هەڵسووکەوتی ئیخوان ئەلموسلمینی میسرییە لە سەرەتای دامەزرانیدا، لەو قۆناغەدا کە چەندین ساڵی خایاند، تەبلیغ و داوەتی ئیسلامی و ڕاهێنانی

ئەخلاقی و عەقیدەتی بووبووبە کاری سەرەکی ئیخوانەکان و هەولّی ئەوە دەدرا کە بیر و ڕێبازی ئەو ڕێکخراوە لە نێو خەلّکدا بلاّو بکرێتەوە و ببێت بە بیر و باوەڕی زالّی نێو کۆمەلّگای میسر. ئیخوانەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستانیش بە گرتنەبەری ڕێگە و ڕێبازیکی بەوجۆرە، ئەیانەوێت نفووز و پێگەی جەماوەری خۆیان بەهێزتر بکەن و بیر و باوەڕەکەیان ببەنە نێو خەلّکی کوردستان. ئەوان بۆ ئەوەی باشتر نفووز بکەنە نێو خەلّك و شەرعییەتێکی زۆرتر بدەن بە خۆیان، ئەیانەوێت پێشکەوتنەکانی دنیای مۆدێرن بکەنە هەوێنی بیر و باوەڕەکەیان و ئیسلامیزەیان بکەن. هەروەها بە شێوەیەکی لیبرالاّنە و نەرم و نیان هەلّسووکەوت دەکەن و بەپێی هەلومەرج و کەش و هەوای کۆمەلّگای کوردەواری بەرنامەکانیان دیاری دەکەن. ئەوان هەولّی ئەوە دەدەن کە ڕەنگ و بۆیەکی ئەمرۆیی ببەخشنە ڕێبازەکەیان و سیما و ڕوالّەتێکی سەردەمیانە بەخۆوە بگرن، بۆ نموونە لە هەلّسووکەوتی کۆمەلایەتیدا و بەنیسبەت دەرکەوتنیان لە نێو جەماوەردا یان لە پێوەندی لەگەل ئازادی ژن و کەلّك وەرگرتن لە شتی جۆرا و جۆریش، گەلێك کراوەتر و ئازادتر لە پێڕەوانی مەکتەبی قورئان ئەجوولێنەوە و بەبێ دەمارگرژییەکی ئەوتۆ لە گەل دیاردە کۆمەلاّیەتییەکاندا مامەلّە دەکەن. (بەپێی یاسا نێوخۆییەکانی تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمین، ژنانی ئەندامی ئەم تەنزیماتە ئەتوانن ببنە کارمەندی دایەرە حوکومییەکان وشوفێریی ماشێن بکەن، ئەندامان ئەتوانن سەتەلایت لە مالّەکانین دابنێن، ئەفرادی سەر بە تەنزیمات بۆیان هەیە بەشداری لە کۆڕ و کۆبوونەوە فەرهەنگی و ئەدەبییەکاندا بکەن و...)

هەرچەند ئیخوانەکان تا ئیستا و بە نیسبەت زۆر شتەوە هەلّوێستێکی ڕوون و ئاشکرایان وەرنەگرتووە، سیمای ڕاستەقینەی خۆیانیان دەرنەخستووە و بە کردەوەش توند و تیژییەکی ئەوتۆیان نەنواندووە, بەلاّم لە ئەساسدا بیر و بۆچوونێکی تەسك و داخراو بەسەریاندا زالّە و ئەوانیش وەك دیکەی پێڕەوانی

بونیادگەری ئیسلامی تەنیا بیر و بۆچوونەکەی خۆیان بە ڕاست و دروست دەزانن. ئەوان بە بەشداریدانی ئەندامان و لایەنگرانیان لە کۆڕ وکۆبوونەوەی جۆراوجۆری نێو کۆمەڵگادا، بیر و بۆچوونی خۆیان بڵاو دەکەنەوە و تەبلیغ بۆ مەرام و بەرنامەکانیان دەکەن، ئەم جۆرە کارکردنە هەمان شێوازی مامەڵە کردنی یەکگرتووی ئیسلامییە لەگەڵ وەزعییەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی باشووری کوردستاندا کە بەشێوەیەکی سیاسیانە و بە دوور لە توند و تیژی بەشداری لە پرۆسەی سیاسیدا دەکات. ئەوەی کە جێگای سەرنجە، ئەوەیە کە تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمینی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی بە نەیاری ڕژیمی ئیسلامی ئێرانی دەزانێت و لە لایەن ئەو ڕژێمەوە زەبری کاریگەری لێکەوتووە، بەکردەوە هەوڵی دوژمنایەتیکردنی ئەو ڕژێمە نادات و هیچ هەڵوێستێکی دیاریکراوی لە بەرابەردا ناگرێت. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە مەسەلەی ریفۆرم و ئیسلاحات کۆمەڵگای ئێرانی خستبووە جووڵە و ئازادیخوازانی کوردیش تێکەڵ بە بەرەی ریفۆرمخوازیی بووبوون، ئیخوانەکان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ و لە ڕێگای نوێنەرەکانیانەوە هەوڵی بەشداریکردنی ئەم پرۆسەیەیان داو چوونە نێو ئەو هاوکێشە سیاسی و کۆمەلایەتییانەی کە هاتبوونە ئاراوە.

تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمینی ڕۆژهەڵاتی کوردستان تا ئێستا هیچ ناو و مۆرکێکی بەخۆوە نەناوە و لەگەڵ کرانەوەی کەش وهەوای سیاسیشدا و سەرەڕای ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە سیاسەتی ڕژێمی ئێرانیدا بە نیسبەت سوننەکانەوە پێکهاتووە، کارەکانی بە نهێنی و شاراوەیی بەڕێوە دەبات. ئەم تەنزیماتە لە زۆربەی شار و دێهات و ناوچە سوننە نشینەکانی کوردستان ئەندام و لایەنگری هەیە و بە کاری تەبلیغ و داوەتکردنەوە خەریکە.

لە باری قەوارە و ڕێژەی ئەندام و لایەنگریشەوە تەنزیماتی باسکراو بە گەورەترین تەشکیلاتی بونیادگەرای ئیسلامی لە کوردستانی ژێر دەستی ئێران

دادەنرێت وخەڵکانێك کە سەربە چین و توێـژە جـۆرا و جۆرەکـانی کۆمـەڵگای کوردستانن بوونەتـە ئەنـدام و لایـەنگری، لەوانـە: مامۆستایانی ئـایینی، مامۆستایانی‌خوێندنگە، فەرمانبەران، وەرزێڕان، کرێکاران و...(بەشێکی زۆر لە ئەندامانی پێشووی مەکتەبی قورئانیش ئێستا لە نێو ڕیزەکانی ئەم تەنزیماتـەدان کە ژمارەیەکیان لێپرسراو و ئەندامی پلەبەرزن )

ڕێبەرایەتی تەنزیماتی ئیخوان لە ڕوژهەلاّتی کوردستان لـەم قۆناغـەدا حالـەتی شۆرایی هەیە, بەلاّم ئەم تەنزیماتە لە ئەساسدا خاوەن ڕێبەرییەکی تاقانەیە و هەر لە ئیستاوە کەس یا کەسانێك بۆ ئەم پۆستە دیاری کراون، لەگەڵ ئەوەدا کە ئـەو کەسانە سەرپەرشتی کارەکان دەکەن و وەك ڕێبەری مەعنەوی چاویان لێدەکرێت، ئەفرادی‌تری سـەر بـە تـەنزیماتیش بـەپێی لێهـاتوویی و شـارەزایی کاریـان پـێ ئەسپێردرێت و ئەرك و مەسئولییەتیان بۆ دیاری دەکرێت. ئەو کەسانەی کە دوای تاقیکردنەوە و وەرگرتنی متمانە ئەبن بە ئەندامی تەنزیمات، بەشداری لـە خـولی جۆرا و جۆری ئامووزش و ڕاهێنانـدا دەکـەن و لـە گـەڵ بـیر و بـاوەڕ و ڕێبـازی ئیخوان ئەلموسلمیندا ئاشنا دەکرێن.

هەرچەند کەسانی وەك:«حسن البنـاء »،«سـید قطـب» و...بوونەتـە ئولگـو و نموونـەی ئینـسانی گـەورە و عـالمی ئیـسلامی بـۆ پێڕەوانـی ڕێبـازی ئیخـوان ئەلموسلمین، بەلاّم ئەحمەدی موفتی زادەش بۆ ئەوان جێگای حورمەت و ڕێزلێنانە و بە ڕێبەرێکی گەورەی ئەهلی سوننە و کەسایەتییەکی دڵسۆز دادەنرێ کـە لـە زیندوو کردنـەوە و ناسـاندی ئیـسلامی ڕاسـتەقینەدا کاریگـەری دانـاوە و لـەو پێناوەشدا گیانی خۆی بەخشیوە.

لەگەڵ ئەوەدا کە تـەنزیماتی ئیخـوان ئەلموسـلمینی ڕۆژهـەلاّتی کوردسـتان بـە شێوەیەکی لیبرالاّنە، هەوڵی گەیشتن بە مەرام و ویـستەکانی دەدات، بـەلاّم ئـەم تەنزیماتـەش وەك بـاقی گـروپ و تاقمـە ئیـسلامییەکانی نـاو بزووتنـەوەی

بونیادگەرای ئیسلامی بەتەمای گەڕانەوەیە بۆ بنەماکانی دینی ئیسلام و بۆ دابەزاندنی شەریعەت تێدەکۆشێت. بە پێچەوانەی پێڕەوانی مەکتەبی قورئان کە قەرەی سیاسەت ناکەون و خۆیان بە گروپێکی سیاسی نازانن، ئیخوانەکان باوڕی تەواویان بە سیاسی بوونی ئیسلام هەیە و دەسەڵاتی ئیسلامی بە باشترین و عادلترین دەسەڵاتەکان دادەنێن. ئەوان وەك گروپێکی «سیاسی، ئیسلامی » هەوڵی زاڵکردنی ئیسلام لە کۆمەڵگادا دەدەن و تەنیا ڕێگای ئەم زاڵکردنەش بە نفووز و ڕەخنەی زۆرتری نێو جەماوەر دەزانن. ئەوەی کە لەم هەلومەرجەدا وەك ئیستراتژی و بەرنامەی سەرەکی ئەم تەنزیماتە دیاری کراوە هەمان ڕەخنەکردنی نێو خەڵك و بەهێزکردنی نفووز و پێگەی جەماوەرییە و هەموو هەڵسووڕان و چالاکییەکی ئەمڕۆی ئەوان بەو مەبەستەیە. تەبلیغ و داوەتکردن، وەرگرتنی ئەندام، ئامووزش و ڕاهێنان و...لەو کارانەن کە بەشێوەی ڕۆژانە لە لایەن ئەندامان و لایەنگرانی تەنزیماتی ئیخوان ئەلموسلمینەوە بەڕێوە دەچن. لە تەواوی ئەو ناوچانەی کە ئیخوانەکان هەڵسووڕانیان هەیە و خاوەن پێگەی تەنزیماتین، خولەکانی تایبەت بە ڕاهێنان لە بواری فکری و عەقیدەتیدا ئاوەڵایە و هەموو ئەندامان بەشێوەی ئیجباری و بە پێی بەرنامە بەشدارییان تیادەکەن. لەم خولانەدا کە لە ماڵی ئەفراد و ئەندامانی باوڕپێکراو دادەنرێن و بە شێوەی ڕۆژانە یان حەوتووی چەند جار بەڕێوە دەچن خولی جۆرا و جۆری ڕاهێنان ئەکرێتەوە و ئەندامانی بەشدار بوو لەگەڵ زۆر شت ئاشنا دەکرێن.

ئیخوانەکان، پێبەندبوون بە دەستووراتی ئیسلام و پێڕەویکردن لە سیاسەت و بەرنامەکانی ڕێکخراوەکەیان، زیاتر لە هەر شتێکیتر بەلاوە گرنگە و خۆیان لەبەرابەر بیرو باوڕەکەیاندا بە بەرپرسیار دەزانن. هەرجۆرە هەوڵ و خەباتێکی نیشتمانپەروەرانە بەلایانەوە بێ‌مانایە و بەگشتی باوڕیان بە شوناسی میللی و نەتەوەیی نییە. ئەوەی کە تا ئیستا لە بواری کردەوەدا ڕووی داوە و هەموولایەك لێی ئاگادارن، بێلایەنی پێڕەوانی ڕێبازی ئیخوان ئەلموسلمینە بە نیسبەت

مەسەلەی میللی و نەتەوەییەوە، ئەوان لە بەرابەر ئەو زوڵم و زۆرەدا کە لە لایەن دەسەڵاتەوە لە گەلی کورد دەکرێت نەك دەنگی نارەزایەتیان هەڵنەبریوە و تۆزقاڵێك ویژدانیان نەجووڵاوە بگرە ئەو کەس و لایەنانەیشیان کە هەوڵیان بۆ دەستەبەرکردنی مافە رەواکانی کوردی زۆرلێکراو داوە بە دواکەوتووی شتی بێبایەخ و پرپووچ داناوە و ناو بردووە. لای ئەوان هەموو داب و نەریت و جەژن و بۆنە کوردییەکان لەبیر چوونەتەوە و هەر جۆرە پیڕویکردن و بەها پێدانێکیان بە حەرام و پێچەوانەی دەستووراتی دینی ئیسلام دادەنرێت.

هەرچەند تەنزیماتی سەر بە ئیخوان ئەلموسلمینی رۆژهەڵاتی کوردستان توانیویەتی لە ماوەی ساڵانی رابردوودا و لە قۆناغی نوێی تێکۆشانیدا گەلێك هەنگاوی بەرەو پێش بنێت و ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، بەڵام نەیتوانیوە بەر بە دروستبوونی گروپ و تاقمی توندرەوی ئیسلامی بگرێت و ببێتە رێگر لە بەردەم ئیسلامی رادیکاڵ و جیهادیدا. سەرهەڵدانی تەنزیماتێکی سەر بە ئەلقاعیدە لەو ساڵانەی دواییدا، دەریدەخات کە فێندەمێنتالیزمی سوننە لە رۆژهەڵاتی کوردستان تاچەند کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو بزووتنەوە ئیسلامییەی کە هەنووکە زۆر شوێنی دونیای کردۆتە مەیدانی کاری تیرۆریستی و تۆقێنەرانە.

## دروستبوونی تۆڕی ئەلقاعیدە و ئیمارەتی تاڵیبان و

## گەڕانەوەی بەشێک لە دنیای ئیسلام بەرەو لای وەهابیگەری و سەلەفییەت

دەستدرێژی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بۆ سەر ئەفغانستان بە بیانووی یارمەتیگەیاندن بە حکومەتی کومۆنیستی ئەو وڵاتە، بوو بە مایەی نیگەرانی موسوڵمانان و پێڕەوانی بونیادگەرای ئیسلامی و جیهادێکی ئیسلامی درێژخایەنی لێکەوتەوە. لە ماوەی چەندین ساڵی جیهاد و بەربەرەکانیدا، هەزاران موسوڵمانی جیهادی لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە بۆ پشتیوانیکردنی ئەفغانییەکان چوونە ئەو وڵاتە و بە ڕیزی بەرەی جیهادییەوە پەیوەست بوون. بە گەرم بوونی ئاگری شەڕ و بەردەوامی هێرشەکانی ئەرتەشی سوور، ژمارەیەکی زۆرتری موسوڵمانان چوونە ئەفغانستان و تەڤلی نێو ڕیزەکانی بەرەی جیهادی بوون، جیا لەوەش بە هەزاران کەسیتر لە ڕێگا و شوێنی جۆرا وجۆرەوە یارمەتی ماڵی و مەعنەوی خۆیان دەگەیاندە شەڕکەرەکانی سوپای ئیسلام و هەوڵی بەهێزکردنی بەرەی جیهادییان دەدا. سەرەنجام دوای نیزیک بە دەیەیەك شەڕ و تێکهەڵچوونی خوێناوی، لە کۆتایی هەشتاکاندا سوپای سۆڤیەت پاشەکشەی کرد و ئەفغانستانی بەجێهێشت. بەرەی جیهادی کە خۆی بە لایەنی سەرکەوتووی شەڕ دەزانی، هاتو هەڵای سەرکەوتنی دەستپێکرد و بانگەوازی درێژەدان و پەرەپێدانی جیهادی ئیسلامی لە دنیادا بەرزکردەوە. ئەم بانگەوازە پێش زەمینەیەك بوو بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی نوێی جیهادی و دامەزرانی گروپ و ڕێکخراوگەلی ڕادیکاڵی ئیسلامی لێکەوتەوە، دروستبوونی تۆڕی تیرۆریستی «ئەلقاعیدە» مۆدێلی عەینی ئەو بزووتنەوەیە و سەرەتای ڕەوتێکی نوێی تیرۆریزمی ئیسلامی بوو کە دواتر بوو بە هەڕەشەیەك بۆ سەر جیهانیان و دەستیدایە کوشتن و تۆقاندنی خەڵکی سڤیل و مەدەنی. دوای کۆتایی جیهادی ئەفغانستان و لە ساڵی

١٩٨٨ميلاديدا، ئوسامە بن لادنی بە ڕەگەز سعوودی کە یەکێك بوو لە یارمەتیدەرانی بەرەی جیهادی و بەشداریی ڕاستەوخۆی جیهادیی کردبوو، داوای لە هەموو موسوڵمانانی جیهان کرد کە لە بەرابەر بەرەی کوفردا یەك بگرن و بەرگری لە مان و مەوجوودییەتی دینەکەیان بکەن.

ئەو کە خاوەن گروپێکی شەڕکەر و جیهادیی تایبەت بە خۆی بوو، دوای ڕێکەوتنی لەگەڵ ڕێبەرانی «الجهاد»ی میسری و شەخسی «ايمن الظواهري» دا، تۆڕی ئەلقاعیدەی دامەزراند و بە کردنەوەی چەندین ناوەندی گەورەی تایبەت بە ئامووزش و ڕاهێنانی کاری نیزامی و تیرۆریستی، ئەفغانستانی کرد بە سەنتەرێك بۆ ڕاهاتن و بڵاو کردنەوەی تیرۆریزمی ئیسلامی. ئوسامە، لە یەکەم هەنگاودا فتوای کوشتن و لە ناوبردنی خاچپەرستان و ڕۆژئاواییەکان و هاوپەیمانانی ئەوانی لە ڕێبەرانی مەعنەوی سوننە وەرگرت و داوای لە جەوانانی جیهادی هەموو وڵاتانی ئیسلامی کرد کە بۆ فێربوونی تاکتیکەکانی شەڕی چەکداری سەردانی ئەفغانستان بکەن. دوای دامەزرانی ئیمارەتی تالیبان و هاتنە سەرکاری دەسەڵاتی بەناو شەرع و یاسای ئیسلامی لەو وڵاتەدا، خولێکی نوێی ئامووزش و ڕاهێنان دەستپێکرد و بە هەزاران کەس لە کەمپ و ئوردووگاکانی ئەلقاعیدەدا خولی تایبەت بە کاری نیزامی و تیرۆریستییان تەواو کرد. بە گەڕانەوەی ئەو کەسانە بۆ شوێنەکانی خۆیان چەندین گروپ و تاقم و تەنزیماتی تیرۆریستی سەر بە ئەلقاعیدە شکڵی گرت و یەکەم نیشانەکانی سەرهەڵدانی تیرۆریزمی ئیسلامی لەو وڵاتانەدا ئاشکرا بوو. ئەمە و بەرقەراری حکومەتی ئیسلامی تالیبان لە ئەفغانستان، گوڕ و تینی زۆرتری بەخشییە لایەنگرانی ئیسلامی ڕادیکاڵ و توندوتیژ لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا و هانیدان بۆ تێکەڵبوون لە گەڵ ئەم ڕەوتە نوێیە. لە هەردوو ناوچەی سوننەنشینی کوردستان

و سیستان و بەلووچستانی ئێرانیش ئـەو کەسـانەی کـە پێـشتر کەوتبوونـە ژێـر کاریگەری بونیادگەری ئیسلامی تێکەڵ بەم ڕەوتـە نوێیـە بـوون و تـەنزیماتێکی توندڕەوی سەر بە ئەلقاعیدە تیایاندا دروستبوو، لەماوەی چەند سـاڵی ڕابـردوودا بە سەدان کەس پێوەندییان بەم تەنزیماتانەوە کردووە و لەگەل بیری وەهابیگەری و سەلەفییەت بەیعـەتیان کـردووە. ئێـستا پێڕەوانـی ئەلقاعیـدەی سـەر بـەم دوو ناوچەیە، بەهەموو شێوەیەك هەوڵی بـەهێزکردنی خۆیـان و ڕاکێـشانی سـەرنجی خەڵك دەدەن و بە تەبلیغکردنی بیری جیهادیگـەری و تونـد و تیژییـەوە لـە نێـو خەڵکی کورد و بەلووچدا خەریکن.

## دروستبوونی یەکەم تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

وەك سوننەتێك و بەپێی ئەو ڕەوتە مێژووییەی کە لـە ئـارادا بـووە، باشـووری کوردستان زیاتر و زۆرتر لە بەشەکانی‌تری وڵاتی کوردان کەوتۆتە ژێر کاریگـەری بـیری بونیادگـەری ئیـسلامی و بۆتـە جێگـە و پێگـەی سـەرهەڵدانی گـروپ و تاقمگەلی سەلەفی و بونیادگەرا. ئەمە جیا لەوەی زەرەر و زیانی بە گـەلی کـورد لەو بەشەی کوردستان گەیاندووە، لەسەر کوردانی ڕۆژهەڵاتیش کاریگەری دانـاوە و بۆتە هۆی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی دیاردەی بونیادگەرایی و توندوتیژی لـەنێو کۆمەڵی سوننەی ئەم پارچەیەدا. هەروەك پێشتر باسمـان لـە کاریگـەری پێڕوانـی ئیخوان ئەلموسلمینی عێراقی لەسەر سوننەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کرد لێرەدا و بۆ ناساندنی زیاتری تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدەش، ئاوڕێك لـە ڕادیکـاڵیزمی ئیسلامی کوردسـتانی عێـراق دەدەینـەوە و کاریگـەریی لایـەنگرانی ئیـسلامی توندوتیـژ و جیهـادی ئـەم بەشـەی کوردسـتان لەسـەر سـوننەکانی ڕۆژهـەڵات، دەردەخەین. ماوەیەك دوای دامەزرانی بزووتنـەوەی ئیـسلامی«١٩٨٧»، مـەلا

کرێکار و چەند کەسی تر لە هاوبیرەکانی لەم ڕێکخراوە جیا بوونەوە و هەوڵی دروستکردنی گروپێکی توندڕەوی ئیسلامییاندا. ئەوان بە تەواوی لەژێر کاریگەری بزووتنەوەی نوێی جیهادیدا بوون، سەردانی ئەفغانستانیان کردبوو و لە نیزیکەوە لەگەڵ جیهادیەکان ئاشنابوو بوون، بۆیە دەیانویست هەرچی زووتر گروپێکی جیهادی پێکبێنن و ببنە پێشڕەوی لایەنگرانی ئیسلامی سەلەفی و توند و تیژ لە باشوری کوردستان.

ئەم هەوڵانە، هاوکات بوو لەگەل ئەو سەرمەستی و شاگەشکەییەی کەدوای شەڕی ئەفغانستان دنیای ئیسلامی داگرتبوو، هەر لەو سەردەمەشدا بوو کە ئوسامە بن لادەن هەوڵی دامەزراندنی تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدەی دەدا و لە فکری پێکهێنانی بەرەیەکی جیهادی جیهانیدا بوو.

سەرەڕای ئەو هەوڵانەی کە دران، کرێکار و دار و دەستەکەی نەیانتوانی لە کارەکەیاندا سەرکەوتن بەدەست بێنن و لە دروستکردنی ئەو گروپەدا ناکام مانەوە، بەڵام دوای ئەو سەرنەکەوتن وناکامییەش لە چالاکی و هەڵسووڕان بەردەوامبوون و پێوەندی خۆیان لەگەڵ گروپ و ڕێکخراوە توندڕەوە ئیسلامیەکاندا زیاتر و پتەوتر کرد. پاش دامەزرانی ڕێکخراوی «ئەلقاعیدە» و بانگەوازەکەی «ئوسامە بن لادن» بۆ دروستکردنی بەرەیەکی یەکگرتووی جیهادی لە جیهاندا، مەلا نەجمەدین «کرێکار» و تاقمەکەی لەگەڵ ئوسامەدا بەیعەتیان کرد و بوون بە پێڕەوی ڕەوشت و ڕێبازی توندڕەوانەی ناوبراو. ئەم پێوەندییە بەرەبەرە، بەرە و پتەو بوون و قایم بوونی زیاتر هەنگاوی ناو لە قۆناغی یەکەمی تێکۆشانی ئەلقاعیدەدا گەلێك کاریگەری لەسەر جەماعەتەکەی مەلا کرێکار دانا.

پاش ڕاپەڕینی (١٩٩١ز) گەلی کورد لە باشوری کوردستان و لە سەر داوای بزووتنەوەی ئیسلامی، کرێکار گەڕایەوە نێو ڕیزەکانی ئەم ڕێکخراوە و لە

کۆنگرەی پێنجەمدا کە ساڵی ١٩٩٢ بەسترا بـە ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی و بەرپرسی بەشی عەسکەری هەڵبژێردرا. بەخشرانی ئەم دەسـەڵاتە بـەکرێکار، لـە هەلومەرجێکدا بوو کە لە لایەك بزووتنەوەی نوێی جیهادیگەری لە ئاستی دنیادا گوڕ و تینی زیاتری بە خۆوەگرتبوو و لەلایەکی تریشەوە بارو دۆخی ئەو دەمـەی کوردستانی باشوور، هەلێکی لـەباری بـۆ دانـانی بنـچینە و بناغـەی گروپێکـی تونـدڕەوی ئیـسلامی ڕەخـساندبوو . بەرپرسـی بەشـی عەسـکەری بزووتنـەوەی ئیسلامی کە بە دوای هەلێکی واوە بوو و چەند ساڵ بوو چـاوەڕوانی دەرفـەتێکی وای دەکرد، بارەگایـەکی سـەربازی لـە ناوچـەی دیانـا کـردەوە و دەسـتی دایـە ئامووزش و ڕاهێنانی ئەو کەسانەی کە ڕۆحی جیهادیگەری لـە بـاقی هێزەکـانی بزووتنەوە زۆرتر بوو و چاوەڕوانیی ئەوەیان لێـدەکرا کـە بکەونـە خزمـەت ئـەو گروپە جیهادییەی کـە بڕیـاربوو لـە داهاتوویـەکی نیزیکـدا دامەبمـەزرێت. ئـەو موجاهیدە کوردانەی کـە پێـشتر سـەر بـە جەماعـەتی کرێکـار بووبـوون و لـە ئەفغانستان و شوێنەکانیتر بە کـاری عەسـکەری ڕاهـاتبوون، وەك مامۆسـتای سەربازگەی دیانا دیاری کران و تەجروبە و ئەزموونی نیزامی خۆیـان دەگوازنـەوە بۆ ئەندامانی خۆیان. بەردەوامی ئەم ڕەوتە و دەرکەوتنی جموجووڵی هاوشێوەی وەك «حەماس و تەوحید» لە باشوری کوردستان، بوو بە هۆی دامەزرانی گروپـی تیرۆریستی «جند الإسـلام » لـە مـانگی نـۆی٢٠٠١دا و ماوەیـەك دواتـر و بـە تێکـەڵبوونی ئـەم گروپـە لەگـەل کۆمـەڵێك تونـدڕەوی دابـڕاو لـە بزووتنـەوەی ئیسلامی، لە ڕێکەوتی(٢٠٠١/١٢/١٠)دا ڕێکخراوێکـی تـری تیرۆریـستی بـە ناوی «انصار الإسلام في کردسـتان» دروستکرا ئەم گرووپە بە دەستووری ڕێبەرانی ئەلقاعیدە و لە ژێر چاودێری تیمێکی سەر بەو ڕێکخراوە کە هاتبووە کوردستانی عێراق دامەزرا و بە شێوەیەکی فـەرمی ئـەرکی نۆێنەرایـەتیکردنی بزووتنـەوەی نوێی جیهادیی لەو بەشەی کوردستان کەوتە ئەستۆ.

گروپی «انصار الإسلام»، بنکە و بارەگاکانی خۆی لە ناوچەکانی تەوێڵە و بیارە کردەوە و ئیمارەتێکی ئیسلامی لەو ناوچانەدا دامەزراند. ئەم گروپە لە ماوەی چەند ساڵ مانەوە و خۆسەپاندنی لەم ناوچەیەدا، جیا لە سەرکوتی خەڵکی ناوچەکە چەندین کاری تیرۆریستی لە دژی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەنجامدا. یەکێك لە سامناکترینی ئەو جینایەتانە کردەوە تیرۆریستییەکەی خێڵیحەمە بوو کە تیایدا چەندین پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی قەتڵ و عام کران. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە توندڕەوە ئیسلامیەکانی باشووری کوردستان، خەریکی تەدریب و ڕاهێنانی ئەفرادی سەر بە خۆیان بوون و زەمینەیان بۆ دامەزراندنی گروپ و تاقمێکی توندڕەو و جیهادی فەراهەم دەکرد، توندڕەوە ئیسلامییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری بزووتنەوەی نوێی جیهادی، جیا لە یارمەتیگەیاندن بە هاوبیرەکانیان لە بەشەکەیتری کوردستان لە هەوڵی دروستکردنی تەنزیماتێکی سەر بە ئەلقاعیدەدا بوون و یەکەم هەنگاوکانیان بۆ دانانی بناغەی ئەو تەنزیماتە هەڵگرتبوو.

هەرچەند دروستبوونی ئەو تەنزیماتە ماوەیەکی زۆری خایاند و پاش چەند ساڵ حاڵەتی عەمەلی و ئاشکرای بە خۆوە گرت، بەڵام بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە ئیسلامیە توندڕەوەکان هەوڵی سەپاندنی بیری سەلەفیگەرییان لە باشووری کوردستاندا دەدا، پێڕەوانی ئیسلامی توند و تیژ و ڕادیکاڵ لە کوردستانی ئێرانیش زیاتر بە بیری سەلەفییەت و جیهادیگەری ئاشنا دەبوون و زۆرتر دەکەوتنە ژێرکاریگەری بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی. پێوەندی و نیزیکایەتی ئەوان و جیهادیەکانی کوردستانی عێراق لەگەل یەکتر، بووە هۆی ئەوەی کە ئەوان زۆرتر هان بدرێن بۆ پێکەوەنانی تەنزیماتێکی توندڕەوی ئیسلامی لە سەر ئەساسی ڕێبازی تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدە. ئەو کەسانەی کە بە کردەوە کەوتبوونە خزمەت مەرام و بەرنامەکانی ڕێکخراوەکەی نوسامە بن لادن، لە سەرەتادا و وەك دەسپێکی کارەکانیان دەستیان دایە هەڵخەڵەتاندن و لە خشتە

بردنی نیزیکانی خۆیان و لەگەڵ بیری توند و تیژی و جیهادیگەری ئاشنایان کردن، ئەم شێوازی تەبلیغ و داوەتکردنە بۆ ماوەیەکی زۆر بە شێوەی شاراوە و نهێنی درێژەی کێشا و تا کاتی دامەزرانی گروپی « انصارالاسلام » لە باشووری کوردستان، درێژەی کێشا. هەر وەك پێشتریش ئیشارەمان پێدا جیا لە هەوڵدانیان بۆ تەبلیغ و ناساندنی خۆیان و ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك، پێڕەوانی ڕادیکالیزمی ئیسلامی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، کەوتنە یارمەتیدان و پشتیوانیکردنی تیرۆریستانی جێگیر لە تەوێڵە و بیارە و تا هەڵکەندن و دەرکردنیان لەو ناوچانە و بۆ ماوەی چەند ساڵ لەم یارمەتیدان و هاوکاریکردنە بەردەوام بوون. ئەم دۆستایەتی و پشتیوانیکردنە بە ڕادەیەك و لە ئاستێکدا بوو کە ڕۆژهەلاتی کوردستانی کردبووە پشتی جەبهەیەکی بەهێز بۆ تیرۆریستانی ئەو دیوی سنوور و هەر جۆرە پێداویستییەکیان لەو ڕێگایەوە بۆ دابین دەکرا. لە پشتیوانی مەعنەوییەوە تا کردنەوەی ماڵی یاران و شوێنی حەوانەوە، چاوساغی و ئیسکۆرت کردن، یارمەتی ماڵی و ناردنی پێداویستی جۆراوجۆر و ... بەشێکی ئەو یارمەتیانەن کە تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدەی ڕۆژهەلاتی کوردستان پێشکەشی جیهادیەکانی باشووری کوردستانی دەکرد. هاوکات لەگەل ئەم هاریکاری و پشتیوانیکردنەدا، ژمارەیەکی زۆرتری کوردانی سوننەی ڕۆژهەلات ئەبوونە پێڕەوی ڕێبازی ئەلقاعیدە و پێوەندییان بەو کەسانەوە دەگرت کە بە کاری تەبلیغ و داوەتی ئیسلامییەوە خەریك بوون. بە دامەزرانی گروپەکانی جوند و ئەنسارو لئیسلام لە باشووری کوردستان، تەبلیغ و داوەتی ئیسلامی لە ڕۆژهەلاتیکوردستان فراوانتر بوو و هەوڵەکان بۆ ناساندنی ڕێبازی ئەلقاعیدە حاڵەتی ئاشکاراتر و جیدی تری بە خۆوە گرت. هاتووچوو و تێکەلاوی تیرۆریستانی باشوور و ڕۆژهەلات بە جۆرێك بوو کە لە هەموو شتێکی یەك ئاگادار بوون و تەداخولی کار و باری یەکتریان دەکرد، لە ماوەی دەسەلاتدارێتی تیرۆریستان لە ناوچەی هەورامان، پێڕەوانی ئەلقاعیدەی کوردستانی ئێران

بەردەوام سەردانی بنکە و بارەگاکانی ئەوانیان دەکرد و بەشداری خولی ڕاهێنانی تیرۆریستی و نیزامی دەبوون .

لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە دەسەڵاتی تاڵیبان لە ئەفغانستان حوکمی دەکرد و تۆڕی ئەلقاعیدە ئەو وڵاتەی کردبووە بنکەی ئامووزش و ڕاهێنانی نیزامی و تیرۆریستی، وڵاتی ئێران بووبووە ڕێگای هاتووچوو و پەڕینەوەی تیرۆریستانی کورد و عەرەب بۆ ئەفغانستان و بە هەزارن کەس لەم ڕێگایەوە خۆیان دەگەیاندە کەمپ و سەربازگەکانی ئەلقاعیدە و بە کاری نیزامی و تیرۆریستییەوە ڕادەهاتن. «وەحید مژدە»، یەکێك لە بەرپرسانی ئەو دەمی ئیمارەتی تاڵیبان لە کتێبەکەیدا بە نێوی (ئەفغانستان و پێنج ساڵ دەسەڵاتی تاڵیبان) ئاوا دەڵێت:

(دوای گۆڕانی هەڵوێستی پاکستان بە نیسبەت تاڵیبانەوە و پاش ئەوەی کە لە سنوورەکانی ئەم وڵاتەدا ڕێ و شوێنی توند و تۆڵی ئەمنی گیرایەبەر بۆ ڕێگرتن بەو موجاهیدانەی کە دەیانویست بەشداری لە خولی تەدریب و ڕاهاتنی نیزامی و تیرۆریستی لە کەمپەکانی ئەلقاعیدەدا بکەن، نیزیك بە نەوەد لەسەدی خۆبەخشەکان، لە ڕێگای ئێرانەوە دهاتنە ئەفغانستان و هەر لەو ڕێگایەشەوە لە ئەفغانستان دەردەچوون.)

ژمارەیەکی ئەو خۆبەخشانە لە ڕێگای سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە دزەیان دەکردە نێو ئێران و لە لایەن تەنزیماتی ئەلقاعیدەوە یارمەتی دەدران و کارئاسانیان بۆ دەکرا، دوای گەیشتنیشیان بە ناوچەکانی سیستان و بەلووچستان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران، بە کۆمەك و چاوساغی توندڕەوە ئیسلامیەکانی سەر بە ئەلقاعیدە لەو ناوچەیە، سنووریان دەبەزاندوو دەچوونە نێو خاکی ئەفغانستان و لەکاتی گەڕانەوەشدا، لە هەمان ڕێگاوە و بە هەمان شێوە خۆیان ئەگەیاندەوە ئەو شوێنانەی کە لێوەی هاتبوون. هاتوچووی ئەو ژمارە زۆرەی موجاهدین بە ئێراندا و پێوەندیکردنیان بە تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدەی کوردستان و

بەلووچستانەوە، گوڕ و تینێکی زۆرتری بەخشییە ئەو تەنزیماتانە و رۆحی جیهادیگەری تیایاندا بەهێزتر کرد. پێڕەوانی ڕادیکالیزمی ئیسلامی کورد و بەلووچ، لەگەڵ ئەوەدا کە لەو هاتووچوو کردنەدا چاوساغ و ڕێنمای موجاهدین بوون، بۆ خۆیشیان سەردانی ئەفغانستانیان دەکرد و فێری کاری نیزامی و تیرۆریستی دەبوون. هەروەها موجاهدینی سەر بە ڕێکخراوە توندڕەوەکانی باشووری کوردستانیش لە ڕێگای ئێرانەوە و بە هاوکاری تەنزیماتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕەوانەی ئەفغانستان دەکران و بەشدارییان لە دەورەگەلی ئامووزش و ڕاهێنانی نیزامی و تیرۆریستیدا دەکرد.

لە سەرو بەندی ڕزگاری عێراقدا و لە درێژەی هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر دوژمنانی ئازادی و دیموکراسیەت، لە یەکەم ڕۆژەکانی بەهاری٢٠٠٣ م. دا، بنکە و بارەگاکانی ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلام لە تەوێڵە و بیارە کەوتە بەر هێرشێکی لەناکاو و چڕوپڕی مووشەکی و دواتریش لە ئۆپەراسیۆنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا ئەم ناوچانە بە تەواوی لە وجوودی ئەو ڕێکخراوە پاك کرایەوە. لەو هێرشانەدا بە دەیان کەس لە تیرۆریستان کوژران و بریندار بوون و پاشماوەکانیشیان لە ڕێگای سنوورەکانی هەورامانەوە خۆیان گەیاندە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. پێڕەوانی ئەلقاعیدە لەم بەشەی کوردستان زۆر زوو بە هانای تیرۆریستە هەڵاتووەکانەوە چوون و گواستنیانەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە پێشتر دیاری کرا بوون، چەند کەس لە گەورە بەرپرسانی ئەنسارولئیسلام و لەوانە «عبدالله شافعي» و چەند بەرپرسێکیتر کە توانیبوویان خۆیان دەرباز بکەن دوای چەند ڕۆژ مانەوە لە شارێکی سنووری، برانە تاران و لە هوتێلێکی ئەو شارەدا نیشتەجێ کران.

هەرچەند تێکشکانی تیرۆریستانی باشووری کوردستان لە سەرەتادا بووبە هۆی نیگەرانی پێڕەوانی ئەلقاعیدەی سەر بە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بەڵام بە هاتنی پاشماوەکانیان و تێکەڵاو بوونیان لە تەك تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدەی ئەم

بەشەی کوردستاندا، ڕەوتی سەلەفیگەری و ڕادیکالیزمی ئیسلامی پێی نایە قۆناغێکی نوێوە و کوردستانی ئێران بوو بە بنکەو پێگەیەکی سەرەکی بۆ تێکۆشانی هاوبەشی تیرۆریستانی باشوور و ڕۆژهەلات. موجاهدینی ئەنسارولئیسلام کە خاوەن ئەزموون و تەجروبەیەکی زۆر بوون لە بواری کاری تەنزیمی و تەبلیغیدا و بەکردەوەش بەشدارییان لە چەندین کاری نیزامی و تیرۆریستیدا کردبوو ئەو ئەزموون و تەجروبەیەیان گەیاندە تەنزیماتی خانەخۆی و هەوڵێکی نوێی داوەت و تەبلیغ کردنیان لەگەڵدا دەستپێکردن. لەو کاتەوە تا ئێستا پێڕەوانی ڕادیکالیزمی ئیسلامی لە کوردستانی ژێردەستی ئێران بەردەوامن لە تەبلیغ بۆ ناساندنی بیر و بۆچوونە توندڕەوانەکەیان و توانیویانە بە دەیان کەس لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە، ئەم تبلیغاتە لە چەند شێوازدا و لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە بەرێوە چووە یان بەرێوە دەچێت کە بریتین لە:

**یەکەم**، تەبلیغ لە ڕێگای مینبەری مزگەوتەکانەوە و بە هۆی ئەو مامۆستا ئاینیانەوە کە پێڕەوی لە ڕێبازی ئەلقاعیدە دەکەن، ئەو مامۆستایانە بە ئاشکرا و ڕاشکاوانە خەڵکی گەڕەك و گوند و شار بە گەڕانەوە بۆ لای ئیسلامی ڕاستەقینە داوەت دەکەن و تیرۆر و تۆقاندن و سەربڕین بە جیهاد لە پێناو دینی خودادا وەسف دەکەن.

**دووهەم**، کردنەوەی ناوەند و سەنتەری جۆراوجۆری تەبلیغاتی وەك: « دارولقورئان »، « کتێب فرۆشی »، «دووکانی سەوت و تەسویر » و... لەم ناوەندانەدا جیا لە ئامووزشی قورئان، هەر جۆرە بەرهەمێکی تەبلیغی وەك کتێب، نامیلکە، وێنە، کاسێت، سیدی و...بڵاو دەکرێنەوە.

**سێهەم**، تەبلیغی زارەکی و دەم بە دەم، هەموو ئەفرادی سەر بە تەنزیمات ئەو ئەرکەیان لە سەر شانەکە بیر و باوڕەکەیان بگەیەننە قەوم و کەس وکار و دۆست

و ئاشناکانیان و بە پێی مەعلوومات و زانیاریەکانی خۆیان ڕوونیـان بکەنـەوە و بیانگێڕنەوە بۆ سەر ڕێگا و ڕێبازی ئیسلامی ڕاستەقینە.

لـە هـەموو جۆرەکـانی تـەبلیغ کردنـدا، قـەول و وادە دەکـرێن بـە ئـامرازی رازیکردنیان و ئەفرادی ساویلکە پێ هەڵدەخڵەتێت. زۆربەی وادەکان ئەو دنیـایین و بە جۆرێك دەدرێن و دەوترێن بەو کەسە کە بە بێ بیر کردنەوە و پرسـیار کـردن وەریان دەگرێت و باوڕیان پێدەکات. گەیشتن بە بەرزترین پلـەی موسـڵمانیەتی و بەخشرانی هەموو گوناهەکان لە لای خوداوەند، چـوونە بەهەشـت و گەیـشتن بـە جوانترین حۆریەکان، بەشێك لەو وادانەن کە بەو کەسانە دەدرێن.

جیا لەو جۆرە خەڵکانە زۆر کەسی تـر کـە خـاوەن ڕابردوویـەکی پـۆزەتیڤ و پێگەیـەکی بـەرزی کۆمەڵایـەتی نـین، کەوتوونەتـە داوی جـاڕدەرانی بـیری سەلەفیگەری و بووون بە گورز وەشێن و گۆپاڵ بەدەستی مەکتەبەکـەی ئوسـامە بن لادەن. هەروەها ژمارەیەکیتریش بە زەبری پووڵ و پارە و بـە هـۆی یارمـەتی ماڵیەوە کەوتوونەتە خزمـەت مـەرام و بەرنامـەکانی ڕایکـاڵیزمی ئیـسلامی و خۆیان بە تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدەدا هەڵپەساردووە.

ئێـستا لـە زۆربـەی شـار و دێهـات و ناوچـە سـوننە نـشینەکانی ڕۆژهـەڵاتی کوردستان، پێڕەوانی ئەلقاعیدە لە حاڵی تـەبلیغ و داوەتکردنـدان و بـەبێ هـیچ گیر و گرفتێك بانگەشەی بیری سەلەفیگەری دەکەن، ئەوان خەڵك بە گەڕانەوە بـۆ بنەماکانی ئیسلام و جیهاد لە دژی دوژمنـانی ئـەو دینـە هانـدەدەن و تـیرۆر و تۆقاندن بە خزمەتی گەورە بە دینی خودا و فێنکی دڵی ئیسلام دەزانن .

ڕەتکردنەوەی هەرجۆرە هەستێکی نەتەوەیی و نیـشتمانپەروەرانە و بـە حـەرام زانـینی هـەموو داب و نەریتـەکانی کۆمـەڵگای کـوردەواری لایـەنی سـەرەکی تەبلیغاتی ئەو تاقمەیە، ئەوان دەسەڵاتی سیاسی کورد لـە باشـووری کوردسـتان

وسەرجەم حیزب و لایەنە کوردییەکان بە کافر و دوژمـنی ئیـسلام و پەرەپێـدری کوفر و بێ ئیمانی دەزانن .

داوەتگەرانی سەر بە ئەلقاعیدە، لە خوتبە و قسەکانیاندا هەرجۆرە خـەبات و تێکۆشانێك لە پێناو مەسەلەی میللی و نەتەوەییدا بـە کـاری خـراپ و غـەیری دینی ناو دەبەن و جەژن و بۆنـە و موناسـبە کوردییـەکان و تەنانـەت ئاهـەنگی شادی و زەماوەند و گۆرانی و... بە پەرەپێدەری فەساد و بێ ئەخلاقی دادەنـێن. لەو شوێنانەی کە پێڕەوانی ئەلقاعیدە و توندڕەوە ئیسلامیەکان زۆرینەن و خاوەن زۆرترین نفـووزی جـەماوەرین، تـەواوی ئـەو شـتانە قەدەغـە کـراون و لـە بـیر چوونەتەوە.

هەرچەند لەباری تەبلیغییەوە، بە بێ پـەردە و ئاشـکرا کـار دەکـەن و هـەوڵی ناساندنی بیر و باوڕەکەیان و ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك دەدەن، بەلاّم لـە ئەساسـدا هەڵسووڕان و تێکۆشانی تەنزیماتی سەر بـە ئەلقاعیـدەی ڕۆژهـەلاّتی کوردسـتان نهێنی و شاراوەیە و زۆربەی کارەکان بە دوور لە چاوی خـەڵك و لـە چوارچـێوەی تەشکیلاتی خۆیاندا جێبەجێ دەکەن. ئەوەی کە بە ئاشکرا دەست دەدەنە تـەبلیغ و هەوڵی نفووز کردنە نێو جەماوەر دەدەن دوو هۆکاری سەرەکی هەیە:

یەکەم، لەبار بوونی کەش و هەوای کۆمەڵگای کوردەواری و نەبوونی هیچ ڕێگر و لەمپەر و دژە هێزێك لە بەرابەریاندا و چاوپۆشی دەسەلاّتی ئێرانـی لـە کـار و کردەوەکانیان و تەنانەت یارمەتیدان و پشتیوانیکردنیان .

دووهەم، زالّبوونی جۆرێك غورور و هەستی خۆبەگـەورە زانـین بـە سـەریاندا، بەجۆرێك کە خۆیان بە نوێنەری ڕاستەقینەی خوداوەند لە ڕووی زەویدا دەزانـن و لەو باوڕەدان کە هەموو شتێك بە دەسـتی ئەوانـە. ئـەوەی کـە دەیکـەن و پێـی هەڵدەستن لەو بیر و باوڕەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەموو شتێکی کردۆتە ئامرازی گەیشتن بە مەرام و ویستەکانی و خودی خۆبەخشەکانیش بەشێکن لەو ئـامرازە.

مرۆڤی خۆبەخش ترسی لە هیچ شتێك نامێنێت، ئەو بەخشینی گیانی خۆی و کوشتنی مرۆڤەکانی بەلاوە گرنگ نییە، ئەو خۆی بە سەفەری دەزانێت و هەموو ئاوات و ئارەزووکانی لە دنیایەکیتردا نەبینێتەوە، بۆیە بە پەلەیە، ڕقی لەم جیهانەیە و بە هەموو جۆرێك هەوڵی زاڵکردنی بیر و باوڕەکەی دەدات، ئەو لەم هەوڵەدا ترسی لە هیچ شتێك نییە تەنانەت لە دەستدانی گیانشی.

جیا لە و هەوڵە چڕوپڕ و فراوانە تەبلیغیە، تەنزیماتی سەربە ئەلقاعیدە لە کوردستانی ژێردەستی ئێران دەستی داوەتە هەڕەشەکردن لە: ناوەندگەلی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری، خەڵکانی عەلمانی و نیشتمانپەروەر و حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان و هەموو ئەو کەس و لایەنانە وەك بەرەی کوفر ناو دەبات، هەروەها بە دەرکردنی نووسراوە و هەڕەشەنامە و بڵاو کردنەوەیان لە نێو خەڵکدا زۆر شتیان بە حەرام و دژ بە دەستووراتی قورئان ناو بردووە و داوایان لە خەڵك کردووە کە لەو شتانە دوور بکەونەوە و بەربەرەکاینیان لەگەڵدا بکەن. بۆ نموونە یەکێك لەو نووسراوانە باس لە خراپی موسیقا دەکات و ئەم هونەرە بە دوژمنی گەورەی دین و دیانەت و بە هۆکاری سەرهەڵدانی کوفر و بێئیمانی ناودەبات. لە ڕستەیەکی ئەو نووسراوەیەدا ئاوا هاتووە :

(ئەو هونەرمەندە گۆرانی بێژانەی کە لە گۆرانیەکانیاندا نەعرەتەی «قەومییەتی و میللیەتی» سەر دەدەن، دوژمنانی سەرەکی وەحدەتی ئیسلامین و خزمەت بە کوفرێکی گەورە بە نێوی «نەتەوە پەرەستی» دەکەن.)

لە چەندین نووسراوە و هەڕەشەنامەی تریشدا، ئارایشی ژنان و کردنەبەری جل و بەرگی ڕۆژئاوایی و... مەنع کراوە و هەر لەم پێوەندییەدا و لە چەند شوێنی کوردستان هێرش کراوەتە سەر چەند ئارایشگەی ژنانە و ئاگریان تێبەردراوە و ماوەیەکیش بە تیزاب، لە نێو شەقام و بازاڕدا جل و بەرگی ژنانیان دەسووتاند.

هەروەك پێشتر باسمانکرد، تەنزیماتی سەربە ئەلقاعیدەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پێڕەوانی ڕادیکاڵیزمی ئیسلامی باشووری کوردستان، خاوەن یەك ڕێگە و ڕێبازی هاوبەشن و بەیەك بەرنامە و ئیستراتژییەوە خزمەت بە مەرامەکەیان دەکەن، ئەم دوو لایەنە تا ئیستا هاوکارییەکی نیزیکیان لە نێوانـدا بـوووە و لـە ئاسـتێکی بەرزدا پشتیوانی یەکتریان کردووە، چەند نموونەیەك لەو پشتیوانی و هاوکاریانەی کـە تونـدڕەوەکانی بەشـی ڕۆژهـەڵات لـە پێڕەوانـی ئەلقاعیـدەی باشـووری کوردستانیان کردووە ئەمانەی خوارەوەن:

١. بەشداریکردنی جیهادیەکانی ڕۆژهەڵات لە شەڕەکانی هـەر دوو ڕێکخـراوی « جند الإسلام » و « انصار الإسلام» لە دژی هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

٢ . هاوکاری و چاوساغی کردنی ئەو خۆبەخشانەی (باشووری کوردسـتان) کـە بۆ ڕاهاتن بە کاری تیرۆریستی و نیزامی سەردانی ئەفغانستانیان دەکرد.

٣ . دابینکردنـی هـەرجۆرە پێداویـستیەکی تیرۆریـستان لـەکاتی حـوکمڕانی ئیمارەتی ئیسلامی تەوێڵە و بیارەدا.

٤. یارمەتیدان، گواستنەوە و میوانداریکردنی پاشماوەکانی « انـصار الإسـلام» دوای هێرشی مووشەکی ئەمریکا لە بەهاری (٢٠٠٣ )دا و هەڵکنرانیان لـە ناوچەکانی هەورامان، ژمارەیەك لەو تیرۆریستە هەڵاتووانە تـا ئیـستاش لـە کوردستانی ڕۆژهەڵات ماونەتەوە.

٥ . ناردن و ئامادەکردنی چەند کەس بۆ ئەنجامی کاری تیرۆریستی و تەقینەوە لە وڵاتی عێراق، بەشداری لە کردەوە خۆکوژیەکەی بـەهاری ٢٠٠٥ ی شـاری هەولێر و تەقینەوەکانی هەمان ساڵی سلێمانیی و هەوڵدان بـۆ تـیرۆر کردنـی بەرپرسانی سیاسی کوردستانی باشـوور، نموونـەی ئاشـکرای بەشـداریکردن و دەخیل بوونی توندڕەوە ئیسلامیەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە لە بەڕێوە بـردن و بەردەامکردنی دیـاردەی تـیرۆر وتۆقانـدن لـە باشـووری کوردسـتان.(دوای

کـرده‌وه تیرۆریـستییه‌که‌ی سـلێمانی و ئاشـکرابوونی ده‌سـتی تیرۆریـستانی ڕۆژهه‌ڵاتی کوردستان له‌و کرده‌وه‌یه‌دا، که‌سانی سه‌ر به تـه‌نزیماتی ئه‌لقاعیـده له‌م به‌شه‌ی کوردستان به بڵاو بوونـه‌وه‌ی هـه‌واڵی ئـه‌و کـاره تیرۆریـستییه و سه‌رنه‌که‌وتنی تیرۆریستان له پێکانی ئامانجـه دیاریکراوه‌کانـدا، بـه ئاشـکرا نیگه‌رانی خۆیان له‌و سه‌رنه‌که‌وتنه و به‌تایبه‌ت پێـوه نـه‌بووی مـه‌لا بـه‌ختیار ئه‌ندامی مه‌کته‌بی سیاسی ی.ن.ك ده‌ربڕی )

وه‌ك بـاقی گـروپ و ڕێکخـراوه تونـدڕه‌وه ئیـسلامیه‌کان، تـه‌نزیماتی سـه‌ربه ئه‌لقاعیده‌ی ڕۆژهه‌ڵاتی کوردستانیش پێکهاتووه له دوو جۆر خـه‌ڵك، جۆرێکیـان ئه‌و خه‌ڵکانه‌ن که له کارو باری خۆیاندا نوخبه و شاره‌زان و لـه ڕووی ئاگاییـه‌وه پێڕه‌وی له ئیـسلامی تونـدڕه‌و و جیهـادی ده‌کـه‌ن، ئـه‌م خه‌ڵکانـه کـه بـه‌زۆری ڕێبه‌رایـه‌تی و سه‌رپه‌رشـتی تـه‌نزیماتیان لـه ئه‌سـتۆیه سـه‌ر بـه چـین و توێـژی جۆراوجـۆری نێـو کۆمـه‌ڵگان، مامۆسـتایانی ئـاینی و خوێندنگـه، ئه‌نـدامانی پێشووی مه‌کته‌بی قورئان و ته‌نزیماتی سه‌ربه ئیخوان ئه‌لموسلمین و... به ڕێبـه‌ران و به‌رپرسـانی ئـه‌م ته‌نزیماتـه ده‌ژمێـردرێن. به‌شـێکی‌تـری پێکهێنـه‌رانی ئـه‌م ته‌شکیلاته خه‌ڵکانی هه‌ژار، که‌م داهات و نه‌خوێنده‌واری نێـو کۆمـه‌ڵگان، ئـه‌م که‌سانه به زۆری خاوه‌ن پێگه‌یه‌کی ئه‌وتۆی کۆمه‌ڵایه‌تی نین و له باری فکرییـه‌وه له ئاستێکی نزمدان. ئه‌وان توانای لێکدانه‌وه و شـرۆڤه‌کردنی واقیعـه‌کانی ده‌ورو بـه‌ری خۆیانیـان نییـه و ئوقـده و تووڕه‌ییـه‌ك بـه نیـسبه‌ت هـه‌موو شـتێکه‌وه سه‌رتاپای وجوودی داگرتوون، بیر و باوڕی ئیسلامی ڕادیکـاڵ و توندڕه‌وانـه ئـه‌و ئوقده و تووڕه‌ییه‌ی تیایاندا «بیلفیعل» کردۆته‌وه و وای لێکردووون که خۆیان به باشـترین و گـه‌وره‌ترین ئینـسانه‌کان بـزانن و حـوکمی کوشـتن و سـه‌ربڕین و قه‌ڵاچۆکردن له سه‌ر خه‌ڵکانی تر که به بڕوای ئـه‌وان کـافرو بـێ ئیمـانن بـه‌ڕێوه ببه‌ن. ئه‌مجۆره خه‌ڵکانه به ئاسانی سه‌ربه‌خۆیی خۆیان له ده‌ست ده‌ده‌ن و ته‌نانه‌ت

وجوود و بوونی خۆیشیان لەم دنیایەدا بەلاوە گرنگ نابێت، ئەوان هیچ ئارەزوو و ئومێدێکیان نیە جگە لە خۆبەخشین و خۆقوربانیکردن لە پێناو دینەکەیاندا.

ئەو کەسانەی کە دەکەونە ژێر کاریگەری بیری سەلەفییەت و جیهادیگەری، لە رێگای تەبلیغاتی نێو مزگەوتەکان یان پێوەندی ئەفرادی تەنزیمات پێیانەوە یان بە هۆی خزم و دۆست و هاوکارانەوە لەگەل ئەم بیر وباوڕە ئاشنا دەبن و دوای وەرگرتنی متمانە، لە خولی ڕاهێنانی فکری و عەقیدەتیدا بەشدار دەکرێن و ئەبن بە ئەندامی تەنزیمات. جیا لەوە و بەمەبەستی ئامووزش و ڕاهێنان لە بوارگەلی جۆراوجۆردا، بەردەوام خولی فێرکاری بە شێوەی نهێنی دەکرێتەوە و ئەفرادی سەربە تەنزیمات بەشدارییان تیا دەکەن. زۆر کەسیش لە ڕێگای بینین و گوێگرتنی سیدی و کاسێت و خوێندنەوەی کتێب و نامیلکەی تایبەت بە بیری توندڕەوی و سەلەفیگەرییەوە دەچنە نێو ڕێکخستنەکانی ئەلقاعیدەوە. جیا لە ئامووزش و ڕاهێنانی نێو خۆیی و سەرەتایی، ژمارەیەك لە ئەندامان بۆ ئاشنا بوونی زیاتر بە بیر و بۆچوونی سەلەفیگەری و وەرگرتنی فەن و فنوونی نیزامی و تیرۆریستی ڕەوانەی شوێنەکانیتر دەکرێن، بەشێك لەو کەسانە لە ناوەندە عیلمی و ئایینییەکانی ناوچەی سیستان و بەلووچستاندا ئامۆزشی عەقیدەتی دەرێن و بەتەواوی دەکەونە قوولایی ئەو هزر و ئەندیشە ئیسلامییەی کە پشتیوانی لە کاری توندوتیژو تیرۆریستی دەکات. هەروەها کەسانێکیش بۆ فێر بوونی فەن و فنوونی نیزامی و تیرۆریستی دەنێردرێنە ئەیالەتی وەزیرستانی پاکستان و لە فێرگە و ناوەندە نیزامیەکانی پاشماوەکانی ئەلقاعیدە و تالیباندا تەدریبیان پێ دەکرێت.

هەرچەند تا ئێستا و بەشێوەیەکی ڕەسمی، تەنزیماتی سەربە ئەلقاعیدەی رۆژهەلاتی کوردستان ناو و مۆرکێکی دیاریکراوی بە خۆوە نەناوە و ئیعلامی مەوجوودیەتی نەکردووە بەلام لە کۆتاییەکانی سالی ٢٠٠٥ ی.م دا گرووپێك کە خۆی بە« الموحدون في كردستان» ناساند بوو لە ڕاگەیەندراوێکدا هەرسێ حیزبی

کوردستانی «حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق»ی ئاگادار کردبووەوە کە لە داهاتوودا چاوەڕوانی هێرش و پەلاماری خۆبەخشە ئیسلامییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان بن، دوای ئەم ڕاگەیەندراوە هیچ کەس و لایەنێك بوونی گروپی «الموحدون في کوردستان»ی پشت ڕاست نەکردەوە و ئەم گروپەش بۆ خۆی هیچ لێدوان و ڕاگەیاندراوێکی تری دەرنەکردووە . «الموحدون» یا «الموحدین» بە مانای «تاقانە پەرەستانە» کە کاتی خۆی بە بزووتنەوەی وەهابییەت دەگوترا.

ئیستا بە سەدان کەس لە شار و ناوچە سوننەنشینەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان وەك ئەندام و لایەنگری ئەم تەنزیماتە لە حالی کار و تێکۆشاندان و بۆ بەهێزکردنی نفووز و پێگەی جەماوەری خۆیان هەولّ دەدەن، هەڕەشەکانی ئەم تاقمە بۆ سەر خەلّکی نەتەوەخواز و نیشتمانپەروەر و حیزب و لایەنە سیاسیەکان و هەولّدانی بۆ سڕینەوەی داب و نەریت و کەلتووری کۆمەلّی کوردەواری، نییەتی خراپ و پڕمەترسی پێڕەوانی ئەلقاعیدەمان لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بۆ دەردەخات و ئاگادارمان دەکاتەوە کە بۆ گەرەنتیکردنی داهاتووی کۆمەلّگاکەمان بەگژ دیاردەی ڕادیکالّیزمی ئیسلامیدا بچینەوە و نەیەلّین ئەو تاقمە بە ئاواتەکانی بگات.

## بەلووچستان،

## مەکۆی کۆن و تازەی ئیسلامی بونیادگەرا و توندوتیژ

سیستان و بەلووچستان یەکێکیترە لە ناوچە سوننەنشینەکانی ئێران کە زۆربەی خەڵکەکەی بەلووچ و سوننەی حەنەفین، ئەم ناوچەیە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی وڵات هەڵکەوتووە و لەگەڵ پاکستان و ئەفغانستان هاوسنوورە. بەلووچەکان لە تەك خەڵکی ئەم دوو وڵاتەدا پێوەندییەکی کۆن و مێژوویی و قەومییان هەیە و ساڵەهای ساڵە کە هاتووچوو و هاوکارییەکی دوولایەنە لە نێوانیاندا بەرقەرارە. خەڵکی بەلووچستان لە مێژووی کۆن و تازەیاندا خاوەن چەندین ڕاپەڕین و بەربەرەکانی نەتەوەیی و مەزهەبین لە بەرابەر دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی ئێران وهێزە ئیستعمارگەرەکاندا .

هەروەك خۆیان دەڵێن: بەربەرەکانی لەگەڵ شیرك و بیدعەت و بەگژاچوونەوەی ئیستعارگەران بە تایبەت ئیستعماری ئینگلیس (بەریتانیا)، بەشێك بووە لە خەباتی مێژوویی ئەوان لە پێناو ئایینی ئیسلامدا و هەوڵێك بووە بۆ هێشتنەوەی شوناس و تایبەتمەندیە نەتەوەییەکانی گەلی بەلووچ .

دوای کوژرانی (ناصرالدین شاە)ی قاجار، خەڵکی بەلووچستان ڕاپەڕینێکی بەرین و گەورەیان ساز کرد و دژایەتی و نارەزایەتی خۆیان لە بەرابەر زوڵم و زۆری دەسەڵاتی ناوەندی و هێزە بیانیەکاندا نیشاندا، پاش هێرش کردنە سەر ناوەندگەلی حوکومی و دەوڵەتی، دەسەڵاتی ناوەندی بە پاڵپشتیی هێزە ئیستعمارگەرەکان دەستی دایە سەرکوتی ڕاپەڕینەکە و جارێکیتر ئەم ناوچەیەی خستەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ و کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی پاشایەتی لە ئێراندا، ناوچەی سیستان و بەلووچستان چەندین ڕاپەڕینیتری بە خۆوە بینی، زۆربەی ئەم شۆڕش و ڕاپەڕینانە

لەگەڵ ئەوەدا کە تا ڕادەیەك ڕەنگ و بۆی نەتەوەییان پێوە دیار بوو، لە بیر و باوڕی مەزهەبی خەڵکەوە سەرچاوەیان دەگرت و لە لایەن عولەما و کەسایەتیە مەزهەبیەکانەوە ڕێبەری دەکران، سیستان و بەلووچستان بە هۆی ئەو تایبەتمەندیە ئیقلیمی و جوگرافیاییەوە کە هەیبووە و هەیەتی، لە زۆربەی ئاڵوگۆڕە نوێیەکانی کۆمەڵگای بەشەری بێخەبەر و بێبەش بوووە و هیچ پێوەندیەکی فکری و ئایدۆلۆژی لەگەڵ دنیای مودێرندا نەگرتووە بەجۆرێك کە ئیستاش زۆربەی خەڵکی ئەم ناوچەیە نەخوێندەوار و بێ سەوادن و لەگەل عیلم و فەنی ڕۆژدا ئاشنا نین. گۆشەگیری خەڵکی ئەم ناوچەیە و دوورەپەرێزییان لە دنیای دەرەوە، وایکردوە کە خورافات و بیر و باوڕی دواکەوتووانەی مەزهەبی و فیرقەگەری لە نێویاندا پەرە بستێنێ و ماموٚستایانی ئایینی و ڕێبەرانی دینی ببن بە چاوساغ و دەلیلی خەڵك و کۆمەڵگا. زۆر بوونی لە ڕادەبەدەری حەوزە و خوێندنگەی ئایینی لە چەندین ساڵی لەوەو پێشەوە و بایەخ نەدان بە خوێندنی نوێ و عیلمی سەردەم، زیاتر و زۆرتر بەلووچستانی بەرە و دواکەوتوویی بردووە و لە وڵاتانی دراوسێشەوە هەمان بیر و بۆچوونی دواکەوتووانە، ڕەوانەی ئەم ناوچەیە کراوە. «مەکتەبی علومی دینی عەزیزیە»، «حەوزەی عیلمییەی عەین ئەلعلومی گەشت سەراوان»، «مزگەوتی مەدەنی زاهیدان» و ... لە زومرەی ئەو شوێنانەن کە بە درێژایی ساڵیانی ساڵ جێگای کۆڕ و کۆبوونەوە و بە یەك گەیشتنی تولابی سوننەی ئێرانی و بیانی بووون و دەرسی فیقهی و ئایینییان تیادا وتراوەتەوە. لە ماوەی چەندین ساڵی سوڵتەی ڕێبەرانی ئایینی و ئیسلامیدا و لە ژێر کاریگەری حەرەکەتی ئیسلامی وڵاتانی دراوسێدا، کۆمەڵگای بەلووچستان بوو بە شوێنێکی لەبار بۆ سەرهەڵدان و ڕەخنەکردنی بیر و باوڕی بونیادگەرایانەی ئیسلامی و بەمەش ڕۆحی جیهادیگەری و توند و تیژی لە نێو گەلی بەلووچدا زیاتر چەکەرەی کرد و تەشەنەی سەند. دوای سەرکەوتنی شۆرش و لە هەلومەرجی نوێی سیاسیدا، چەندین حیزب و سازمانی

نەتەوەیی و مەزهەبی لەم ناوچەیەدا سەریان هەڵدا، گەلی بەلووچ کە ساڵیانی ساڵ هەر چەشنە ئازادیەکی لە لایەن دەسەلاتە یەك لەدوای یەکەکانی ئێرانەوە لێ زەوت کرابوو، لە کەش و هەوای تازەی سیاسیدا هەوڵی دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانیدا و حیزب و لایەنە نەتەوەخواز و نیشتمانپەروەرەکانی خۆی بۆ گەیشتن بە ماف و خواستەکانیان پشتیوانی کرد. بە پێی ئەو رابردووە مێژووییەی کە گەلی بەلووچ و ناوچەی بەلووچستان خاوەنین، حیزب و لایەنە سیاسیەکانی سەر بەم ناوچەیەش نەیانتوانی لەژێر کاریگەری رێبەرانی ئاینی و ناوەندە مەزهەبییەکان دەر بچن و زیاتر لە وەی بایەخ بە مەسەلەی میللی و نەتەوەیی بدەن هەوڵی بەرجەستە کردنەوەی بیر و باوڕی مەزهەبی خەڵکیان داو بوون بە پارێزەری خواستە مەزهەبییەکانی کۆمەڵی سوننەی بەلووچستان. لە نێو ئەو حیزب و پارتە سیاسیانەدا کە لەو سەردەمەداو بە نوێنەرایەتی گەلی بەلووچ سەریان هەڵدابوو و سەنگی دیفاع لە مان و مەوجوودیەتی ئەو گەلەیان لە سنگ دەدا، جیا لە چەند رێکخراوی چەپی و نەتەوەگەرا، هیچ کامیان بیریان لە رزگاری گەلی بەلووچ نەدەکردەوە و دڵیان بۆ ئازادی بەلووچستان لێی نەدەدا. هەرچەند فرەیەك لەو لایەنانە خواستە میللی و مەزهەبیەکانیان بە یەکەوە و لە یەك بەرنامەدا گونجاندبوو و شوعاری ئازادیان لەم دوو بوارەدا بەرز کردبووەوە، بەڵام ئەم لایەنانە لە ئەساسدا باوڕیان بە مەسەلەی میللی و ئازادی نەتەوەیی نەبوو و بە کردەوەش هەوڵیان بۆ نەدەدا. ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە بۆ خۆیان غەمخۆری گەلی بەلووچ نەبوون و رزگاریی و ئازادی ئەو نەتەوە زۆر لێکراوەیان بەلاوە گرنگ نەبوو، هەوڵی دەرپەڕاندنی ئەو کەس و لایەنانەشیان لە مەیداندا دەدا کە بە رۆحی ئاگایی و دەروەست بوونەوە بۆ وەدی هێنانی خواستەکانی گەلەکەیان تێدەکۆشان.

دوای شۆڕش مەولانا عەبدولعەزیز تێکۆشانی خۆی دەست پێکردوو رێبەریی بەشێك لە بزووتنەوەی (میللی، مەزهەبی ) بەلووچستانی گرتە دەست، بەڵام

پاش ئەوەی کە نەیتوانی بە باشی ڕۆڵی ڕێبەرایەتی خۆی بگێڕێت، بەرە و لاوازی ڕۆیشت و هەڵوەشایەوە. دوو ساڵ دواتر و لە حاڵێکدا کە کێشە و ناکۆکی نێوان لایەنگرانی بزووتنەوەی مەزهەبی و نەتەوەخواز، سیستان و بەلووچستانی داگرتبوو و گەلی بەلووچ جارێکیتر کەوتبووە ژێر زوڵم و زۆری دەسەڵاتی ناوەندی، «سازمانی موحەممەدی ئەهلی سوننەت» بە ڕێبەری مەولانا عەبدولمەلیك دامەزرا، ئەم سازمانە دژایەتیکردنی لایەنە چەپ و میللیگەراکانی کردە کاری سەرەکی خۆی و کەوتە خزمەت سیاسەتەکانی دەسەڵاتی ناوەندی. مزگەوتی مەدەنی زاهیدان بوو بە شوێنی کۆڕ و کۆبوونەوەی پێڕەوان و ئەندامانی سازمانی موحەممەدی و خولی ڕاهێنانی سیاسی و عەقیدەتی تیادا کرایەوە. ئەم گروپە هەرلە سەرەتاوە لەگەڵ سوننەکانی دەرەوە و ناوەوەی ئێران پێوەندی گرت و کەوتە وەرگرتنی تەلەبە بۆ ئامووزش و ڕاهێنان لە بوارە جۆرا و جۆرەکاندا و بە مەبەستی خوێندنی ئایینی لە مزگەوتی مەدەنی و حەوزەی عیلمی دارولعلومی زاهیدان. سازمانی موحەممەدی ئەهلی سوننەت و مەکتەبی قورئانی کوردستان بە ڕێبەری ئەحمەدی موفتی زادە پێوەندییەکی گەرم و دۆستانەیان بەیەکەوە بوو و هەردوولا لە دامەزراندنی شۆرای شەمسدا بەشدار بوون. پاش چەند ساڵ تێکۆشان و خزمەتکردن بە مەرام و بەرنامەکانی ڕژێمی ئیسلامی، سەرئەنجام ئەم گروپەش کەوتە بەر جەفای دەسەڵات و هەرجۆرە هەڵسوڕان و تێکۆشانێکی لێ قەدەغە کرا. لەو سەروبەندەدا جیهادی ئیسلامی لە وڵاتی ئەفغانستانی دراوسێدا بە دژی ئەرتەشی داگیرکەری یەکێتی سۆڤیەت لە ئارادا بوو و کۆمەڵی سوننەی بەلووچستانی ئێرانیش کە پێوەندییەکی کۆن و مێژوویی لەگەڵ گەلی ئەفغانستاندا بوو کەوتە ژێر کاریگەری ئەم جیهادە. بە گەرمتر بوونی جیهادی ئەفغانستان و بەرە و پێشچوونی بزووتنەوەی نوێی ئیسلامی، جامیعەی سوننەی بەلووچستانیش هەوڵ و هەڵسووڕانەکانی خۆی بەرفراوانتر دەکرد و بۆ زاڵکردنی بیری بونیادگەری ئیسلامی لە نێو جەماوەردا

تێدەکۆشا. ئەوان کە نیگەرانی برا موسوڵمانەکانیان بوون لە ئەفغانستاندا و ئەو وڵاتە ئیسلامییەیان لە مەترسی داگیرکردن و دارماندا ئەبینی زۆر زوو کەوتنە یارمەتیدانی بەرەی جیهادی و لە هیچ جۆرە هاریکاری کردنێکی مادی و مەعنەوی ئەوان دریغیان نەکرد. ئەم پشتیوانی و یارمەتیدانە بە درێژایی ساڵانی جیهاد بەردەوام بوو و تا کۆتایی شەڕ و دەرچوونی هێزی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەفغانستان درێژەی کێشا. جیا لە یارمەتیدانی ڕاستەوخۆی جیهادیەکان، ڕێبەرانی مەزهەبیی بەلووچ پێوەندی خۆیان لە تەك تاقم و گروپە توندڕەوەکان و ڕێبەرانی بزووتنەوەی نوێی ئیسلامیدا گەیاندە ئاستێکی بەرز و کەوتنە پێڕەوی کردنی ئەو ئەندیشە ئیسلامییە جیهادییەی کە هاتبووە ئاراوە. یەکێك لەو ڕێبەرانەی کە بوو بە هاندەری پێڕەوانی بونیادگەرای ئیسلامی بەلووچستان و ئەوانی خستە ژێر کاریگەری ئەفکار و ئەندیشەکانی خۆیەوە، کەسایەتی ناسراوی نێو بزووتنەوەی توندڕەو و جیهادی «عبدالله عزام» بوو، ئەو جێگای باوڕ و متمانەی هەموو پێڕەوان و لایەنگرانی ئیسلامی توندڕەو و پردێکی قایمی پێوەندی بوو لە نێوان تاقم و گروپە ئیسلامییە ڕادیکاڵەکاندا. ماڵەکەی ئەو لە پیشاوەری پاکستان بووبوو بە شوێنی مانەوە و حەسانەوەی ئەو جیهادییە خۆبەخشانەی کە لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە و بۆ بەشداریکردنی جیهادی ئەفغانستان دەڕۆیشتن، لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا کە خۆبەخشەکان لە لای ئەو ئەمانەوە، بەردەوام قسەی بۆ دەکردن و ڕۆحی جیهادیگەری و شەڕخوازییانی بەهێزتر دەکرد. ((عبدالله عزام)) لە وتە و ئامۆژگاریەکانیدا فێربوونی فەن و فنونی نیزامی و شارەزابوون لە شێوازەکانی شەڕکردنی بۆ هەر موسوڵمانێکی خۆبەخش و جیهادی بە پێویست دەزانی و ڕێگای نیزامی و شەڕئەنگێزانەی بە مەرجی سەرەکی سەرکەوتنی ئیسلام دادەنا، ئەو لە ساڵانی جیهاددا چەند جار سەردانی ئەفغانستانی کرد و لە نیزیکەوە بەرەی شەڕکەر و جیهادی بەسەرکردەوە و بەشداری لە خولی ڕاهاتنی ڕەزمی و

نیزامیشدا کرد. عەزام، دۆستێکی هەرەنیزیکی ئوسامە بن لادەن و یاریدەرێکی باشی ناوبراو بوو لە دامەزراندن و دروستکردنی تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدەدا. دوای دامەزرانی ئەلقاعیدە و دەستپێکردنی ڕەوتێکی نوێی جیهاد و خۆبەخشین، توندڕەوە ئیسلامیەکانی سیستان و بەلووچستان تێکەڵ بەم ڕەوتە بوون و کەوتنە ژێرکاریگەری مەرام و بەرنامەکانی ئوسامە بن لادەن، ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ دروستبوونی تەنزیماتێکی ئیسلامی توندڕەو و ڕادیکاڵ لە نێو کۆمەڵی سوننەی بەلووچستاندا و بووبە هۆی دەستپێکردنی خولێکی نوێی تەبلیغ و بانگەشەی بیروبۆچوونی سەلەفیگەریانە. بە سەرکەوتنی بەرەی دواکەوتوو و سەلەفی لە ئەفغانستاندا و درووستبوونی ئیمارەتی ئیسلامی تاڵیبان (١٩٩٦م)، لە لایەك پێڕەوانی بزووتنەوەی نوێی جیهادی لە ناوچەکانی سیستان و بەلووچستانی ئێران گوڕ و تینی زیاتریان بەخۆوە گرت و لە لایەکی‌تریشەوە یارمەتی و پشتیوانی ئەوان لە دەسەڵاتی ئیسلامی ئەفغانستان و گروپ و ڕێکخراوە توندڕەوەکانی جێگیر لەو وڵاتە گەیشتە قۆناغێکی تازە. دوای کرانەوەی کەمپ و ئامووزشگەکانی ئەلقاعیدە و داوەتی سەرلەنوێی ئوسامە بن لادەن لە موسوڵمانانی وڵاتانی ئیسلامی بۆ چوونە نێو ئەفغانستان و فێربوونی فەنو فنوونی نیزامی و تیرۆریستی، بە هەزاران کەس لە جەوانانی دڵگەرم و خۆبەخشی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی ڕێگای ئەو وڵاتەیان گرتەبەر.

ئەوان لە سەرەتادا، لە ڕێگای پاکستانەوە خۆیان دەگەیاندە کەمپەکانی ئەلقاعیدە و لەو ڕێگایەشەوە دەگەڕانەوە وڵاتی خۆیان یان ڕەوانەی شوێنێکی‌تر دەکران، بەڵام دواتر و بەهۆی گۆڕانی سیاسەتی دەوڵەتی پاکستان بە نیسبەت ئیمارەتی تاڵیبانەوە، هاتووچووی خۆبەخشەکان بەو وڵاتەدا قەدەغەکرا و بەمەش وڵاتی ئێران بوو بە ڕێگای پەڕینەوەی موجاهدینی موسووڵمان بۆ ئەفغانستان. ناوچەی سیستان و بەلووچستان بەهۆی هاوسنوور بوونی لەگەڵ ئەفغانستان، بوو

بە خاڵی پەڕینەوەی خۆبەخشەکان و تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدەی ئەم ناوچەیەش بوو بە چاوساغ و دەلیلیان و لە هیچ جۆرە هاوکاریکردنێکیان درێغی نەکرد.

لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە دەسەڵاتی تاڵیبان لە ئەفغانستان حوکمی دەکرد و تۆڕی ئەلقاعیدەش ئەو وڵاتەی کردبووە بنکە و پێگەی ڕاهێنان و ئامووزشی تیرۆریستان و پیلاندانان بۆ کاری تیرۆریستی، پێڕوانی ئەو تۆڕە لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئێران، وێڕای یارمەتیدان و هاوکاریکردنی موجاهدینی دەرەکی و گروپ و تاقمە تیرۆریستییەکان، توانییان لە نێو کۆمەڵگای بەلووچستاندا جێگای خۆیان بکەنەوە و بن بە تەنزیماتێکی بەهێز، ئەم تەنزیاتە بەشێوەیەکی چڕو و پڕ و بەردەوام تەبلیغی مەرام و بەرنامەکانی ئەلقاعیدەی دەکرد و خەڵکی بۆ گەڕانەوە بۆ باوەشی ئیسلامی ڕاستەقینە داوەت دەکرد.

پاش لێدانی ئەفغانستان و ڕووخانی ئیمارەتی تاڵیبان و هەڵکنرانی تۆڕەکەی ئوسامە بن لادەن لەو وڵاتە، بەشێك لە پاشماوەکانی ئەلقاعیدە و تاڵیبان و لەوانە چەندین کەس لە گەورە بەرپرسانیان پەنایان بۆ لای هاوبیرەکانیان لە ناوچەی سیستان و بەلووچستانی ئێران هێنا و بوون بە میوانی تەنزیماتی سەر بە ئەلقاعیدە لەم ناوچەیە. بە هاتنی ئەو تیرۆریستانە و تێکەڵبوونیان لەگەڵ توندڕەوە بەلووچەکانی ئێران، ڕەوتێکی نوێی داوەتی ئیسلامی و تەبلیغکردن دەستی پێکرد و ئەم ناوچەیە بوو بە بنکەیەکی گەورەی ڕاهێنان و پەروەردەکردن و چەندین ناوەندی فێرکاری و ئامووزشی تیادا کرایەوە. تا ئێستا بە سەدان کەس لە خۆبەخشە گەنجە سوننەکانی ئێرانی لەو ناوەندانەدا فێری کاری نیزامی و تیرۆریستی کراون و بە ڕۆحی خۆبەخشین و لەخۆبوردوویییەوە ڕاهاتوون. جیا لەم ناوەندانە زۆربەی خوێندنگە و حەوزە عیلمیەکانیش بوون بە جێگای تەبلیغی بیری سەلەفیگەری و کەوتوونەتە خزمەت ئەو ڕەوتە نوێیەی کە تیرۆر و تۆقاندن بە جیهاد لە دژی نەیارانی دینی خودا و گەیشتن بە شەریعەتی ئیسلامیی دەزانێت. یەکێك لەو ناوەندانە حەوزەی دارولعلوومی زاهیدانە کە گەورەترین

خوێندنگەی ئەهلی سوننەی ئێرانە و ساڵانە بە سەدان تەلەبەی کوڕ و کچی سوننە بۆ خوێندن لە چەندین بواری مەزهەبی و ئایینی لەم ناوەندەدا وەردەگیرێن.

دارولعلوومی زاهیدان تا ئێستا چەندین خولی ئاموزشی و خوێندنی ئایینی بە ئەنجام گەیاندووە کە دوایین خول چەند مانگ لەوەو پێش کۆتایی هات، ڕۆژەکانی ١٠ و١١ی خەرمانانی ١٣٨٤ی هەتاوی (٢٠٠٥ی.م) کۆبوونەوەی کۆتایی ئەم خولە لە شاری زاهیدان و بە بەشداری سەد و پەنجاهەزارکەس بەڕێوە چوو کە نوێنەرانی تاقم و گروپە ئیسلامیەکانی وڵاتانی پاکستان، سووریا، تاجیکستان و... و ڕێبەرانی سوننەی ئێرانی بەشدارییان تیادا کرد. بەڕێوەچوونی ئەم خولانە بە شێوەی ساڵانەیە و دوای تەواو بوونی هەر ساڵێکی خوێندن مەراسمی کۆتایی بەڕێوە دەچێت.

لە ماوەی یەکساڵی ڕابردوودا گرووپێکی چەکدار بە نێوی «جنداللە»ی بەلووچستان، دامەزران و دەستبەکاربوونی خۆی ڕاگەیاند و بە کردەوەش دەستیدایە خۆناساندن و خۆدەرخستن. جوندولا، لەگەڵ ئەوەدا کە گروپێکی هاوشێوەی تالیبانە و بۆ دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام و دامەزرانی خەلافەتێکی ئیسلامی هەوڵ دەدات، خۆی بە دوژمن و نەیاری دەسەڵاتی شیعەی ئێرانییش دەزانێت. لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوودا و بەمەبەستی ڕزگارکردنی ئەو چەند ئەندامەیان کە لە لایەن ئێرانەوە زیندانی کراون، تاقمی ناوبراو دەستیان دایە بارمتەگیری و لە یەکەم هەوڵدا لێپرسراوێکی دەزگای ئیتلاعاتی سیستان و بەلووچستانیان ڕفاند و پێشنیاری گۆڕینەوەیان لەگەڵ بەندکراوەکانی خۆیاندادا بەڵام بە هۆی ڕازی نەبوونی دەسەڵاتی ئێرانی بە ئاڵ و گۆڕ و مامەڵە لەگەلیاندا، دوای ماوەیەك بارمتەکەیان سەربڕی و سەرەکەیان ناردەوە بۆ بەرپرسانی ڕژێمی ئێران.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٥ یشدا هەمان گروپ دەستیگرت بەسەر سەربازگەیەکی هێزە ئینتیزامییەکانی ئێراندا و نۆ کەسی بە دیلگرت و

جارێکیتر داوای بەردانی ئەندامانی خۆی و گۆڕینەوەیانی کرد لەگەڵ بەدیل گیراوەکاندا، دەسەڵاتی ئێرانی کە بۆخۆی پشتیوانێکی گەورە و ناسراوی گروپ و تاقمە تیرۆریستییەکانە و لەگەڵیاندا پێوەندییەکی گەرم و دۆستانەی هەیە، لە چەند لاوە هەوڵی ڕزگارکردنی ئەو نۆکەسەیدا و سەرئەنجام بە نێوبژیوانی دۆستانی هەردوولا و بە بەربوونی بەندکراوەکانی جوندولا لە زیندانی ئێران، بارمتەکان ڕزگاریان بوو. گروپی جوندولا زۆرتر لە ناوچە چڕ و شاخاویەکانی وەزیرستانی پاکستان و لە لای پاشماوەکانی ئەلقاعیدە و تاڵیباندا ئەمێننەوە و بارەگای سەرەکییان لەو ناوچەیەدایە.

(ئەیالەتی وەزیرستان یەکێکە لە ناوچە دوورە دەست و دواکەوتووەکانی پاکستان و لە نیزیك سنوورەکانی ئێران و ئەفغانستان هەڵکەوتووە، خەڵکی ئەم ناوچەیە زۆربەیان بەلووچ و لە باری مەزهەبییەوە لە ژێر کاریگەری بزووتنەوەی نوێی ئیسلامیدان. ئەوان لە لایەن دەسەڵاتی پاکستانەوە دەچەوسێنەوە و لە هەر جۆرە ئیمکاناتێك بێبەشن. ئەم ناوچەیە بە هۆی ئەو زەمینە لەبارەی کە هەیبووە و هەیەتی، بۆتە پەناگەیەکی باش و ئەمن بۆ گروپە ئیسلامییە توندڕەوەکان و کراوەتە ناوەندێکی گەورەی ئاموزش و ڕاهێنانی تیرۆریستی و نیزامی. بەپێی ئەو زانیاریانەی کە تا ئێستا بەدەست هاتوون، پاشماوەکانی ئەلقاعیدە و تاڵیبان و بەرپرسانی پلەیەکی ئەو دوو تاقمە لەم ناوچەیەدا خۆیان حەشارداوە و وەزیرستانیان کردۆتە پێگەیەك بۆ پەرەپێدانی بیری جیهادیگەری و توند و تیژی. لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٦ی میلادیدا و لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە هێرشێکی مووشەکی کرایە سەر گوندێکی سەر بە وەزیرستان و چەندین کەس لە چەکدارە تیرۆریستەکانی کوشت و بریندار کرد دوابەدوای ئەوەش هێزەکانی سوپای پاکستان هەڵمەتێکی پاككردنەوە و تووناکردنی شەڕخوازە ئیسلامییەکانی جێگیر لەم ناوچەیەیان دەستپێکرد کە تا ئیستاش درێژەی هەیە و تیایدا دەیان کەس لە توندڕەوە ئیسلامییەکان کوژراون.)

## سەرچاوەکان:


١ – تاريخ نهضتهای ديني- سياسي معاصر، دكتر علي اصغر ليي

٢ – جنبشهای اسلامی در جهان عرب، هرايردكميجان- حميداحمدي

٣ – افغانستان و پنج سال حكومت طالبان، وحيد مژده

٤- مجله چشم انداز ايران، واژەنامه كردستان (پائيز١٣٨٤ )

٥- حەوتەنامەی ئاسۆ، ژماره ٨٦ و ٨٧ سالی ١٣٨٤

